


238 posts | 19.2k followers | 7 following

Promote | Edit Profile

📚 PDF كتێبی 📚 پەڕەی فەرمی
Public Figure

للره

باشترین و بەسوودترین و پڕ خوێنەرترین كتێبەكان
بە خۆرایی و بە شێوەی PDF داگرە

.

Ganjyna

.

لینكی كتێبەكان 👇 ئەم لینكە بكەرەوە بۆ داگرتنی كتێبەكان
drive.google.com/folderview?id=1gk8e3nSJGJLu36xeLUjwdbjgTSVslbo_







    

پرۆژەی خوێندنەوە بۆ هەموان
زنجیرە کتێبەکانی بڕیار «١٥»



# نامە نووریەکان



بەرگی دووەم

د. عادل شێخانی



ناوی کتێب: نامە نوورینەکان - بەرگی دووەم

نووسینی: د. عادل محمد شێخانی

دیزاین: گۆڤاری بڕیار

تیراژ: ٢٠٠٠ دانە

ساڵی چاپ: ٢٠١٨

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان، ژمارەی سپاردنی (١٢٥٣) ی ساڵی ٢٠١٥ی پێ دراوە



دەزگای بڕیار بۆ چاپوپەخش وبڵاوکردنەوە
مؤسسة بريار للطباعة والنشر والتوزيع





# نامە نووریەکان

نامە نووریەکان .. ملوانکەیەکن لە زیو، مانگانە پەیامێکن بۆ ئازیزترین کەس، چرپەیەکن بۆ ڕۆحە پاکەکان، نیگایەکن بۆ ڕووخسارە نورینەکان!

شەونمێکن لە موناجاتی سەحەر، ئەسرینێکن بۆ گوڵاوپرژێنی دڵ!

لەگەڵیدا دەچینە نێو دەریای سەکینەی ئیلاهیو پروشەی بارانی میهری خودایی!

ئاوێتەبوونە بە ئەوینی پاکو لەزەتی عبودییەت.

پشوویەکە بۆ ڕۆح، هەوارێکە بۆ حەسانەوە لە شەکەتیومەینەتی، ئەم ڕۆژگارە!

ژیانە لەگەڵ پەروەردەی پەروەردگارو باوەڕ بە مەعبودی گەورەو شەیدابوونە بە ئەسمائی حوسناو سیفاتی عولیای زاتی ئیلاهی!

نامە نووریەکان وتەی دڵە بۆ دڵو چرپەی ڕۆحە بۆ ڕۆح، ساتەکانی ژیان لەگەڵیدا، خۆشترینو بەهادارترین، ساتەکانی تەمەنتانن..

به هیوای نزای خێری ئێوەین..

تەنها شتێك، کە مرۆڤ هەرگیز لێی بێزار نابێ، زیکرو یادو باسی خۆشەویستییەکەی خۆیەتی، بە شێوەیەك لە دژوارترین ساتەکانا، لە نێوان مەرگو ژیانا، لە قووڵایی دەردو ژانا، خۆشترین خەیاڵو شیرینترین باسوخواس، باسو خەیاڵی یارە، هەر لەبەرئەوەشە، «عەنتەرە» بە «عەبلە» دەڵێ:

وَلَقَد ذَكَرتُكِ والرِّماحُ نَواهِلٌ - مِنّي وبِيضُ الهِندِ تَقطُرُ مِن دَمي

فَوَدَدتُ تَقبيلَ السُيوفِ لأَنَّها - لَمَعَت كَبارِقِ ثَغرِكِ المُتَبَسِّمِ

عەنتەرە" لە گەرمەی شەڕو زرەی شمشێرو سروودی مەرگا، "عەبلەی"دێتەوە یاد، کاتێك یادی دەکات، کە ڕمەکان، ڕووی تێدەکەنو شمشێرەکان خوێنی ئەویان لێ دەتکێ!

لەو ساتەدا، لەو دۆخە ناسكو سەختەدا! هەموو شتێ لە یاد دەکا، دەیەوێت دەمبنێ بە دەمی ئەو شمشێرە سپییە خوێناوییانەی، کە دەیانەوێت ڕۆحی لێ بسەننەوە، دەزانن بۆ؟ چونکە ئەو دیمەنە، لە دیمەنی لێوی "عەبلە" دەکا، کاتی پێکەنین!

ئەوە مونتەهای بەڵگەی خۆشەویستیو حەقیقەتی زیکرو یادی مەحبووبە!

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمۡ فِئَةٗ فَٱثۡبُتُواْ وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا لَّعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴾ الأنفال: ٤٥

خوداوەند فەرمان بە باوەڕداران دەکات، کاتێ بەرەنگاربوونەوە

لەگــەڵ دوژمن، ئارام بگـــرنو یادی خودا زۆر بکەن، تا ســـەرکەوتوو، سەرفراز بن!

ئیدی چی باســێك، لە باســی مەحبووبی گــەورەی دڵ: خوداوەند، خۆشترەو چی وتەیەك لە زیکرو فیکری ئەو، شیرینترە!؟

یــادی خـــوداو مەقامـــی خۆشەویســـتی خوداوەندو گەیشـــتن بە مەحەببەتـــی ئـــەو زاتە گەورەیـــە، قووتی دڵو ژیانـــی ڕۆحو خۆراکی گیانە، نووری چاوو تیشکی خۆری ئیمانە! دەرمانی دەردی دڵو گیانە، بێ ئەو ژیانە، ڕۆح مردووە، بێ ئەو نوورە دنیا تاریکســـتانە، بێ ئەو شـــیفایە، نەخۆشـــیو دەردو بەلا، لاشە دەڕزێنێو بێ ئەو لەزەتە، ژیان دەبێتە دۆزەخ!

بێ ئەو خۆشەویســـتییە، ناگەینە مەنزڵی ڕۆح، بۆنی بەهەشـــت ناکەین، ناتوانین ببینە ڕێبواری ڕێگای خودا!

بەڵام کاتێ وەکو ئیبنولقەیم دەفەرموێ: داری خۆشەویستی خودا، لــە دڵدا ڕووا، بە ئاوی ئیخلاصو موتابەعــەی پێغەمبەر (صلّى الله عليه وسلّــم) ئاو درا، میوەی جۆراوجۆر، بەرهەم دێو بەردەوام بە بەرهەمە، بە ویستی خودا، ڕەگی لە نێو دڵو لقیشی، دەگاتە سیدرەتولمونتەها!

خــۆ ئەگەر بچینە ســـەر تاریفـــی "خۆشەویســـتی"، هەرچەندە "ئیبنولقەیـــم" پێـــی وایـــە، کە هیـــچ پێناســـەیەك ڕوونتـــر نیە بۆ خۆشەویستی لە وشەی "خۆشەویستی خۆی"، وەلێ دواتر، (٣٠) پێناسە بۆ خۆشەویستی باس دەکات، لەوانە:



یەکەم: خۆشەویستی، مەیلی بەردەوام، بە دڵی ویڵو سەرگەردان.

دووەم: پێشخستنی خۆشەویست، بەسەر هەموو شتەکانی دیدا "إيثارُ المَحبوبِ، عَلى جَميعِ المَصحوبِ."

سێیەم: هاوڕابوون لەگەڵ خۆشەویستو گوێڕایەڵیکردنی لە کاتی ئامادەییو ئامادەنەبوونیدا.

چوارەم: سڕینەوەی هەموو سیفاتی خۆتو توانەوە لە خۆشەویستیدا.. بە شێوەیەك، کە خۆشەویستت لەبەر خودی خۆی خۆشدەوێو بەس!

پێنجەم: ڕازیبونی دڵ، بە هەموو ویستو فەرمانەکانی مەحبووب.

شەشەم: لەگەڵ ئەنجامدانی ئەوپەڕی خزمەتو ملکەچیدا، هەمیشە ترسان لەوەی، وەکو پێویست ڕێزو حورمەتی مەحبووبی نەگرتبێ!

حەوتەم: بە کەمزانینی زۆری خۆتو بەزۆر زانینی کەمیی خۆشەویستت، چونکە خۆشەویستی ڕاستەقینە هەرچی بکات، بۆ خۆشەویستیو ئەگەر ڕۆحی خۆشی ببەخشێ، هەر بە کەمی دەزانێو شەرم دەکات؛ باسی بکات، بەڵام ئەگەر کەمترین شتی دەسکەوێ لە خۆشەویستی، ئەوە زۆر بە گەورەی دەزانێو زۆری پێ زۆرە! وەکو ئەبو ئەسری میکیالی دەڵێ:

قَليلٌ مِنكَ يَكفِيني، وَلكِنَّ قَليلَكَ لا يُقالُ لَه قليلُ



هەشـــتەم: بـــەزۆر زانینی گوناهـو تـــاوانو بەکەمزانینی تاعەتـو ملکەچبوونو عیبادەتت!

نۆیەم: خۆشەویســـتیو دەســـتلەملانبوونی تاعەتـــی مەحبووبـو دوورکەوتنەوە لە سەرپێچیکردن.

دەیەم: زاڵبوونی یادو ســـیفاتو ناوی مەحبووب، بەســـەر دڵیداو داگیرکردنی هەستو نەستو خەیاڵی.

یانزەیەم: بەخشینی هەموو شتێ بە مەحبووب، بە شێوەیەك، کە هیچت نەمێنێ!

دوانزەیـــەم: خۆشەویســـتی ئەوەیـــە، کـــە لە نێو دڵـــت، جگە لە مەحبووب، کەسی دی نەبێ، وەکو نالی دەڵێ:

شـــەقـــی کـــە، غـــەیـــری حـــوبـــبـــی تـــۆی تـــێـــدا بـــێ
بـــە دەســـتـــی خـــۆت دڵـــم دەربـــێـــنـــە قـــوربـــان

ســـیانزەیەم: بەردەوام گازندە لە خۆت بکەیتو هەرگیز لە کاری خۆت ڕازی نەبیت، کە بۆ خۆشەویستی دەکەی!

چواردەهەم: دەبێ غیرە بکەی لە مەحبووبەکەت، کە کەسێکی دی هەبێت، هێندەی تۆی خۆشبوێ!

پازدەهـــەم: ئەو ویســـتو ئیرادەیەیـــە، کە لە نێو دڵـــدا ڕوواوەو بەرهەمەکەشی مورافەقەتو ملکەچبوونە بۆ مەحبووب!

شازدەهەم: دەبێ خۆشەویست، بەشی خۆی فەرامۆش بکاتو هیچ داوایەکـــی لە بیر نەمێنێو جگە لـــە مەحبووب، نە هیچی لەبیر بێو نە داوای هیچ بکات!



حەقدەهەم: دوورکەوتنەوە لە هەمو خۆشـــیو ئاسوودەییەکی دڵ، جگە لە خۆشیو ئاسوودەیی گەیشتن بە خۆشەویست.

هەڵبەت هەموو ئەمانە، شوێنەوارو بەرهەمی خۆشەویستین، نەك تاریفو پێناســـە، چونکە هەروەکو دەڵێن: پێناسەکردنی خۆشەویستی، زەحمەتە..

ئەگەر ئێمە پێناســـەی بکەین، ســـنووورداری دەکەین، ئەو کارەش نابێت، چونکە خۆشەویســـتی، بێســـنوورەو هەرگیز سنووری بۆ دیاری ناکرێت.

هەموو ئەمانەش، کە باســـمان کرد، پێویســـتیان بە شەرحو ڕاڤەو ڕوونکردنەوە هەیە، وەلێ نەك تەنها بە قسەو بە گوفتار!

نـــا ئازیزم، خۆشەویســـتی بـــە خوێندن، ناخوێندرێ.. بە وشـــە، گوزارشتی لێوەناکرێت..

ئێمە ناتوانین کەس فێری خۆشەویستی بکەین!

بەڵکو دەبێ مرۆڤ، بە دڵو ڕۆحی، مومارەسەی بکات!

بە کردارو سلوك، لە خۆشەویستی خودای گەورە تێبگاتو ڕێگای ئەوینـــی خودایی بگرێت، چون خۆ ئاســـان نییە نێـــوت ببێتە وێردی مەملەکەتی ئەعلاو بێژن وەها بەندەیەك، خۆشەویستی خودایە!!

چونکە ڕێگای خۆشەویســـتیی خـــودا، تەنها بۆ ئەوە نییە، کە تۆ خودات خۆشبوێو خودا "محبوب"ی تۆ بێ، وەها کارێك، خۆ زەحمەت نییە!

وەلــێ دەبێت تۆش ببیتە "محبوب"ی خــودا! ئەمەیە مونتەهای ئەمەل!

ئەمەیان سەختە! خودا خۆشەویستی تۆ بێ، خۆ عەجەبێ نییە! وەلێ گەر تۆ "محبوبی" خودا بی، ئەمەیە عەجەبو ئەمەیە گەورەیی!

وای لە نیعمەتی گەیشــتن بەم مەقامە گەورەیە؛ ﴿يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ﴾

المائدة: ٥٤

لــە نامــەی داهاتوومــدا لەگــەڵ خاڵەکانی دی، خۆشەویســتیو تاریفـو شــوێنەوارەکانی بەردەوام دەبین، بە ویســتی خودا! دەتسپێرم بە خودا.............

نامەی ڕابوردوو، حــەزم نەدەکرد ماڵاواییت لێ بکەمو خامەکەم دابنێــم! چون لەوە ناخۆشــتر نییە، لە گەرمــەی زیکری مەحبووبی خۆتدا، لە قسان بوەستیو دەست هەڵگری!

ئازیزم لەوێ ڕا، حەڤدە پێناسەمان، بۆ خۆشەویستیی خودا باس کرد.

هەژدەهــەم: یەکتاپەرســتیی مەحبــووب، بــە ویســتو ئیرادەو ئیخلاصو ڕووکردنی هەموو ویستو داوایەك بۆ ئەو! هەرچی دەیکەی، بۆ وییەو هەرچیت دەوێ، تەنها لەوی داوا دەکەی!

نەك لە کەسی دی!

نابێ ئیددیعای خۆشەویستیی ئەو بکەیتو بەڵام دەست لە غەیری ئەو پان بکەیتەوە، لە کەسێکی دی بترسیو ڕووی ڕازو نیازت لەو بێ!

نۆزدەهــەم: یەکتاپەرســتیی مەحبــووب کــە خودایــە لــە "خۆشەویســتیدا"، بەشــێوەیەك، کــە جگــە لە ئەو، کەســی دی، دڵی داگیــر نەکردبــی! چون هەر کات لە دڵدا، بەشــێك درابوو بە غەیری خودا، مەســکەنێك هەبوو، بۆ خۆشەویســتیی کەســێکی دی، ئەوا ئەو خۆشەویستییە، تەواو نییە!

بیســتەم: چاوپۆشــینی دڵ، لــە ماســیوای مەحبــووب ئێرەییو غەیرەیە، بەڵام بەرامبەر بە مەحبووب هەیبەتو شەرمو شکۆیە، دەبێ چەندەت خــۆش دەوێ، ئاواش تەعزیمو هەیبــەتو ڕێزی بپارێزیو

بەرامبەری چاوانت دابخەیت!

بیســـتو یەکەم: خۆشەویستیی ڕاستەقینە ئەوەیە، کە بە تەواوی مەیل، مەیلت تەنها لەو بێ!

ئەوت لە ســەرو ماڵو ڕۆحت لەپێشــتر بێ، لە نهێنیوئاشــکرادا، موافیقی فەرمانی بی، پاشــان هەســت بەوپەڕی کەمتەرخەمی بکەی بەرامبەری!

بیستو دووەم: خۆشەویستی، ئاورێکە لە دڵدا، ماسیوای مەحبووب، هەموو دەسووتێنێ!

بەشێوەیەك، کە لە دڵدا، جگە لە موڕادی ئەو، هیچی دی نەمێنێ!

بیســـتو سێیەم: خۆشەویســـتی، پێشکەشــکردنی تەواوی هەوڵو تەقەللایـــە، لەگەڵ وازهێنان لە گازنـــدەو گلەیی، ئەمەش لە بەرهەمو مافی خۆشەویستییە!

بیســـتو چوارەم: دەبێ هێندە مەستو مەشغوولی مەحبووب بێ، تا کاتی دیدار، ئەو تاســـەو شـــەوقو مەســـتییە لا نەچـــێ، هەر بۆیە خۆشترین لەززەتی ئەویندارانی لە بەهەشتا، دیداری ئیلاهییە!

بیســـتو پێنجەم: کەس وەپێش مەحبووبی خۆی نەخات، جڵەوی کاروباری خۆی، نەداتە دەست کەس، جگە لە ئەو.

بیســـتو شەشـــەم: چوونە ژێر ڕکێفی بەندایەتیو کۆیلایەتی بۆ



مەحبووبو ڕزگاربوون لە کۆیلایەتیی ماسیوای ئەو.

بیستو حەوتەم: خۆشەویستی، سەفەری دڵە، وەدووی مەحبووبدا، ئاوێتەبوونی بەردەوامی زمانە، بە یادی ئەو.

ئیبنولقەییمیش دەڵێ: سەفەری دڵ، واتە: شەوقی دیدار، ئاوێتەبوونی زمانیش بە زیکری مەحبووب، بێگومان ئەوەی کەسێکی خۆش بوێت، هەمیشە زۆر یادی دەکا!

بیستو هەشتەم: خۆشەویستی، نە بە جەفا کەم دەکات ونە بە وەفا زیاد دەکات!

کەواتە: نە جەفای مەحبووب، کەمی دەکات، نە چاکەی مەحبووبیش، زیادی دەکات!

بیستو نۆهەم: مەحەببەت وەهایە، کە بە کوللەن مەشغووڵی مەحبووبی خۆت بی، هەموو شتێکیشت، لە پێناویدا بەخت بکەی! چیت هەیە، هەرچییەك کە هەتە!!

سیهەم: کە ئیبنولقەییم ئێژێ: جامیعی هەموویەتی، ئەبوبەکری کیتتانی دەڵێ: لە شاری مەککە، لەنێو زانایاندا، باسووتاریفی مەحەببەت هاتە پێش، بە "جونەیدی بەغدادی"یان گوت، کە لە هەموویان چکۆلەتر بوو: دەی تۆ، چیت هەیە بیڵێ ئەی عێراقی. ئەویش سەری داخستو چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك، پاشان سەبارەت بە ئەویندارێی

ڕاستەقینە گوتی: (بەندەیەکە، خۆی لەیاد چووەو پەیوەستە بە یادی پەروەردگاری، خەریکی جێبەجێکردنی فەرمانی ویەو بە چاوی دڵ تەماشـــای دەکات، دڵی بە نووری هەیبەتی ئیلاهی سووتاوە! شەرابی سافییە، لە پیاڵەی میهرو خۆشەویستیی خودایی، خوداوەند، پەردەی غەیبی بۆ بینینی حەقیقەت بۆ لا داوە، گەر قســە بکا، بە ویســتی خودایــە، ئەگەر بدوێ، لەبارەی خودایە، ببزوێ بە فەرمانی خودایە .. بوەستێ، هەر لەگەڵ خودایە.. ئەو بەندەیە، "بالله و مع الله"یە.)

ئامادەبــوان، هەموو گریانو گوتیان: لــەم وتەی تۆ زێتر نییە، ئەی تاجی عاریفان!!

ســەبارەت بەو ڕێگایانەی، مرۆڤ دەگەیەنێت بە خۆشەویستیی خودا، ئیبنولقەییم (١٠) ڕێگا باس دەکات:

یەکەم: خوێندنەوەی قورئان، بە ڕامانو بیرکردنەوەو تێگەیشتن لە ماناکانی.

دووەم: نزیکبوونــەوە لــە خودا، بــە ئەداکردنــی "نەوافیل"و سوننەتەکان، دوای ئەنجامدانی فەرزەکان.

سێهەم: یادکردنی بەبەردەوامیو لە هەموو ئەحواڵێکا، بە زمانو دڵ، بــە کــردارو بە گوفتار، چون بەشــی بەندە لە خۆشەویســتیی، هێندەی یادکردنێتی بۆ خودا.

چوارەم: پێشخستنی خۆشەویستییەکانی خودا، لەسەر شاوەتو ئارەزوو، وێڕای هەڵکشان بەرەو ئەوینی خودایی، هەرچەندە ڕێگا سەخت بێ!

پێنجەم: موتالای دڵ بۆ ئەسمائی حوسناو سیفاتی عولیای خوداوەندو زانینو بینینی شوێنەواریان.. ئەوەی خودا بناسێ لە ڕێگای ئەسمائی حوسناو سیفاتی عولیاوە، بێگومان خۆشی دەوێت.

شەشەم: بینینی چاکەو فەڕو بەرەکەت و نازونیعمەتەکانی خودا.

حەوتەم: لە هەمووی گرنگتر، شکان وملکەچبونی دڵە بەکوللی، لە بەردەستی مەحبووبدا.

هەشتەم: چوونە خەڵوەت لەگەڵ خودا، کاتی نزوولی ئیلاهی، لە سێیەکی کۆتایی شەودا، ئەو کاتەی لەژێر باڵی ڕەشی شەوا، خۆشەویستانی خودا، بۆ موناجاتو تیلاوەی کەلامی خودا، دەچنە نێو ژوانی ئەوینی خودایی، بە تەواوی ئەدەبو خشووعو ملکەچیو ئەوینەوە، لە خزمەتی پەروەردگاری مەزندا، دەوەستنو بە چرپەی دڵ، ڕازونیازی خۆیانی عەرز دەکەن، لە کۆتا ساتەکانی ئەسحاریشدا، بە فرمێسکو گریانو ئیستیغفارەوە، ماڵاوایی لەو ژوانە شکۆدارە دەکەن.

نۆیـــەم: چوونـــە نێو کـــۆڕو مەجلیســـی ســـاڵحانو پیاوچاکانو ئەویندارانی ڕاســـتگۆو بەهرەمەندبوون لـــە وتەی جوانو حیکمەتو داناییيان، گوێگرتن لە خزمەتیانداو قسەنەکردن، تەنها کاتی پێویست نەبێت.

دەیـــەم: دوورکەوتنـــەوە لە هەموو هۆکارێك، کـــە دەبێتە هۆی دوورکەوتنەوەی دڵ لە خودای گەورە.

ئازیـــزم، بـــەم هۆکارانـــە، ئەویندارانی گەیشـــتن بـــە پلەوپایەو مەنزڵگاکانی مەحەببەتی ئیلاهی.. بەڵام سەرەتا، دەبێت ڕۆح، ئامادەی ئەم گەشتە بێو چاویش شارەزای ڕێگا.

بە ئومێدی دیدار، بە خودات دەسپێرم...

کە باس دێتە سەر ﴿يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ﴾ المائدة: ٥٤

ئیدی ڕۆح دەهەژێو دڵ دەکەوێتە ژێر پرووشەی نارەقی شەرمەزاریو فرمێسك لە چاواندا قەتیس دەبێو تەزووی هەست کردن بەگەورەیی ئەوینی خودایی سەراپای لاشەی ئەویندارا دادەگرێ!

خوداوەند خۆشەویستیی خۆی پێش دەخات «خودای گەورە ئەوانی خۆش دەوێو ئەوانیش خودای گەورەی خۆیانیان خۆش دەوێ!

چونکە گرنگ نییە تۆ خودات خۆش بوێ، ئەوەی گرنگە ئەوەیە؛ خودا تۆی خۆش بوێ!

ئای لەو کەسەی خودا خۆی دەفەرموێ: خۆشم دەوێ!

ئازیزم، قورئانی پیرۆزو فەرمووده شیرینەکان، لێوانلێون لە باسی ئەو شتانەی کە خودا پێی خۆشەو ئەنجامدەرانی خۆش دەوێت، لەوێدا ڕێگا بەرەو گەیشتن بە ئەوینی خودایی بەڕوونی دیاری کراوە!

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ﴾ البقرة: ٢٢٢

﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ آل عمران: ١٤٦

﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ آل عمران: ١٣٤

ئیبنولقەیم دەفەرموێ: «ئەگەر مەقامی «محبة» نەمێنێ، ئەوا هەموو مەقاماتی ئیمانو ئیحسانیش نامێنێ، مەنزڵگاکانی چوون بەرەو خودا لە نێو دەچن، خۆشەویستیی خودا ڕۆحی هەموو کاروکردارو پلەوپایەیەکە، بەڵکو ئەو خودی ئیخلاسو خودی ئیسلام خۆیەتی؛

چونکە ئیسلام تەسلیمبوونە بە خودا بە تەواوی خۆشەویستیو تەواوی ملکەچییەوە!...

مەحەببەتی ئیلاهی حەقیقەتی عبودیەتە بۆ خودا، ئایا دەکرێ ڕازیبوون بە خوداو سوپاسو سەناکردنیو خەوفو خەشییەو تکاو ڕەجای خودا، بێ خوشەویستی؟!

ئایا ئارامگرتن، ئەگەر خۆشەویستی لەگەڵ نەبێ، چۆن دەبێ؟! بەڵکو سەبرو ئارامیی ڕاستەقینە، تەنها هی خۆشەویستانی خودایە، ئەوان پشتیان بە مەحبووبی خۆیان بەستووە بۆ گەیشتن بە هەموو ئاواتو ئامانجەکانیان!

زوهد لە دونیا نابێ، ئەگەر بەندە لە هەموو خۆشەویستییەك زاهید نەبێ، جگە لە خۆشەویستیی خودا!!

شەرمو شکۆ، وجودی نابێ ئەگەر خۆشەویستی نەبێ، خۆشەویستی وا دەکا؛ دڵ لێوانلێو بێ لە هەیبەتو جەلالو شەرمو شکۆی ئیلاهی!!

گەر خۆشەویستی نەبێ، قرچە لە جەرگەوە نایەو دڵ گڕ ناگرێ بۆ تاسەی دیدار، شەوانە خەو لە چاوان ناتۆرێو لە ئەسحارا فرمێسکی گەرم نارژێ بەسەر لێوی هەڵقرچاوا!!

خۆشەویستی نەبێ، دەستی هەژاریو کەساسیو کزۆڵی، بڵند ناکرێ بۆ ئاسمان!

خۆشەویستی نەبا، پێغەمبەری نازدار، نەیدەگوت:

(وأسألك لذّةَ النظر إلى وجهك والشوق إلى لقاءك).

چونکە خۆشەویست دەزانێ، هیچ لەزەتێك لە تەماشاکردنی ڕوخساری یارو هیچ تاسەیەك لە تاسەی دیدار خۆشتر نییە!

تا خۆشەویستی نەبێ، بەندە ناتوانێ، ملکەچی فەرمانەکانی خودا بێت، وەلێ ئەو کاتەی دیوەخانی دڵ، ئاوەدانە بە یادی خوداو چرای خۆشەویستیی خودا، خانەی دڵی ڕووناك کردۆتەوە، بەندە بە سەدای (لَبَّيكَ وَسَعدَيك)؛ بەرەو لای خودا هەنگاو دەنێ.

ئیبنولقەییم زێتر لە «٥٠» ناوو جۆرو سیفاتی خۆشەویستی باس کردووە، بەڵام گەورەترین پلەی خۆشەویستی «عبودییەتە»؛ کە جگە لە خودا، بۆ کەسی دی ئەنجام نادرێ.

مەقامی خۆشەویستی، هەموو تەکلیفاتی ئیلاهی، دەکاتە تەشریفات، هەموو زەحمەتێك دەکاتە ڕەحمەتو هەموو میحنەتێك دەکاتە مینحەت، ئەوامیرو نەواهیی خودا، دەبنە لەزەتی ڕۆحو ئاواتی دڵ، ئیدی دڵ هەست بە تەنیایی ناکا، دڵێك هۆگری خودا بێ، چی ئاتاجی بە بەندەیە؟!

ئاوێتەبوون بە حوببی ئیلاهی، وا دەکا کە بەندە، لە هەموو دەوروبەر بێئاگا بێو دونیاو باقوبریقی فانی، نەتوانن سەرنجی ڕابکێشن!

هەرگیز ڕێگە نادا؛ خۆشەویستی داروبەردو زێڕوزیوی دونیا، موزاحیمی خۆشەویستیی خودا بن!



چما کەسێك، تامی لەزەتی ئەوینی خودایی کردبێ، ئیدی جگە لە وەصڵی ئیلاهی، هیچ مەتڵەبێکی دی دەمێنێ؟!

چونکە ئەوەی گەیشتبێ بە خودا، ئیدی شتێك نامێنێ چاوەڕوانی بکات..

هەر بۆیە گوتراوە: (مَن وَجَدَ اللهَ فماذا فَقَدَ ومَن فَقَدَ اللهَ فماذا وَجَدَ).

داود پێغەمبەریش (سڵاوی خودای لێ بێت) لە نزاکانیدا دەپاڕایەوەو دەیگوت:

«اللّهُمَّ إنِّي أَسْأَلُكَ حُبَّكَ وَحُبَّ مَنْ يُحِبُّكَ، وَالْعَمَلَ الَّذي يُبَلِّغُني حُبَّكَ ، اللّهُمَّ اجْعَلْ حُبَّكَ أَحَبَّ إِلَيَّ مِنْ نَفْسي وَأَهْلي وَمِنَ الْمَاءِ الْبَارِدِ».

واتە: خودایە؛ خۆشەویستیی خۆتو ئەو کەسانەم پێ ببەخشە، کە تۆیان خۆش دەوێ.. خۆشەویستیی ئەو کارەم بخەرە نێو دڵ، کە دەمگەیەنێ بە خۆشەویستیی تۆ.. خودایە؛ خۆشەویستیی تۆم لا خۆشەویستتر بێ لە نەفسو ماڵی خۆمو خۆشەویستتر بێ لە ئاوی سارد.

ئیمامی هەرەوی دەڵێت: «مەحەببەت نیشانەی ڕێبوارانی تەریقەتی ئیلاهیو پێناسەی بەندەو خودایە؛ چونکە خودا، خوداوەندەو بەندەش، بەندەی ملکەچو خۆشەویستیش لەو نێوانەدایەو ئەڵقەی پەیوەندیی نێوان خوداو بەندەیە!

پاشان سەبارەت بە پلەوپایەکانی ئەم خۆشەویستییە دەڵێت:

پلەی یەکەم: ئەو مەحەببەتەیە، کە هیچ خەیاڵو وەسوەسەیەك لە دڵدا ناهێڵێو خزمەتکردنی مەحبووب، دەبێتە لەزەتی ڕۆحو هەموو بەڵاو موسیبەتێکی لا سووكو سانا دەکات.

پلەی دووەم: بەشێوەیەکە، کە خۆشەویستیی خودا، لە سەرووی هەموو خۆشەویستییەکەوەیە!

زمان هەمیشە، سەرقاڵی زیکری مەحبووبەو دڵیش پەیوەستی شوێنەواری سیفاتی مەحبووبەو چاویش نیگای لەسەر ئالاءو ئایاتی بێسنووری خوداو گەیشتنە بە مەقاماتی مەحەببەتی ئیلاهی.

پلەی سێیەمیش: خۆشەویستییەکە، کە دڵی خۆشەویستان کەمەندکێش دەکات.. بەشێوەك، کە زمان ناتوانێ، گوزارش لەو خۆشەویستییە بکاتو وەسفی بکات. ئیدی لە دەریای ئەو خۆشەویستییەدا مەحو دەبێتو جگە لە ڕووکردنە زاتی ئیلاهی، ڕووگەیەك نازانێ!

خۆزگە بە ڕێبوارانی ئەم ڕێگایەو سالیکینی ئەم تەریقەتە!

یەکێـك لـە مەنزلگاکانـی ﴿ إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ﴾، مەنزلگای «شـەوقو تاسـەی دیداری مەحبووبە»، کە ئاواتی هەمـوو ڕێبوارانی ڕێگای عبوودیەتو مەداریجی سـالیکینی هەڵکشـانە بـەرەو مەنزلگا بەرزەکانی بەندایەتی!

سەبارەت بە ئایەتی: ﴿ مَن كَانَ يَرۡجُواْ لِقَآءَ ٱللَّهِ فَإِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ لَأٓتٖۚ ﴾ العنكبوت:٥ ئیبنولقەییـم دەڵێت: ئەمە دڵدانەوەو خەمڕەوێنییە بۆ موشـتاقینی دیداری ئیلاهی، خوداوەند بەو کەسانە دەفەرموێ: شەیدایانی دیداری من، دەزانم ئێوە ئۆقرەتان لێ بڕاوە بۆ لیقای من، منیش ژوانم دیاری کردووەو نزیکە ئەو سـاتە بێت، کە سـاتی ژوانو دیداری خوداوەندە لەگەڵ ئەویندارانی.

ئازیزم، خوداوەند خۆی دەزانێ تاسـەی دیدارو هەستی دڵ چەندە ئەسـتەمە.. ئەو تاسـەیە، مرۆڤ وەك مۆم دەتوێنێتەوە، ئەگەر هیوای دیدار نەبایە، دڵ ئۆقرەی نەدەگرتو ئەویندار هەر زوو ڕۆحی دەسپارد.

نالی ناهەقی نییە، کە دەڵێ:

دەمـێـکـە وا لـەسـەر پـێـیـەك دەسـووتـێـم
لـەشـەوقـی تـۆ، بـە مـیـسـلـی مـۆمو هـەر مـام

شـەوقی دیدار، شـوێنەوارێکە لە شـوێنەوارەکانی خۆشەویسـتی؛ چونکە ئەو تاسـەیە بۆ دیدار، سـەفەری بەردەوامـی دڵە، بەرەو لای مەحبووب!

ئیمامی قوشەیری دەڵێ: تاسە، هەژانی دڵە، بۆ لیقای مەحبووب!



یاخــود دەڵێن: تاســەی دیــدار، هەڵقرچانی نــاخو گرگرتنی دڵو لەتبوونی جگەرە!

هەرچەندە خۆشەویستی، گەورەترە لە تاسە؛ چونکە تاسە، بەرهەمی ئەوە، هێزی ئەو تاسەیەش، سەرچاوەکەی ئەو خۆشەویستییەیە!

یەحیای کوڕی موعاز دەڵێ: نیشــانەی تاســەو شەوقی ڕاستەقینە، بڕینەوەی ئەندامەکانە لە شیری ئارەزوو شەهەوات!

چونکــە ئــەو کاتــەی ئەوینــدار، وەکــو پەروانــەی دەوری چرا، هەڵدەقرچێ لە دووریی مەحبووبیو تاســەی دیدار هەراسانی کردووە، ئیدی ئاوڕ ناداتەوە بۆ لای هیچ ئارەزوویەك!

بۆچــی خۆشەویســتییەك دەمێنــێ، لە زەتێك دەمێنــێ، بیری لێ بکاتەوە.. جگە لە بیرکردنەوە لە لەزەتی دیدار؟!

خواناســێك دەڵێ: نیشانەی تاسەی حەقیقی، حەزکردنە بە مردن؛ بۆ گەیشــتن بە لیقای خوداوەند، لە کاتی خۆشیو ڕاحەتدا، هەروەکو یوســف پەیامبەر (ســڵاوی خودای لێ بێ)، کاتێك خرایە نێو بیرەکە، نەیگوت: خودایە ڕۆحم بکێشەو ڕزگارم بکە، یاخود کاتێك خرایە نێو زیندان، وەهای نەگوت!

بەڵام کاتێك دەسەڵاتی کەوتە دەستو هەموو موڵکی میسری کەوتە ژێر ڕکێف، لە لووتکەی دەســەڵاتو خۆشــیو موڵكو سەروەتدا، داوای گەڕانەوەی بۆ لای خوداوەند کرد: ﴿ تَوَفَّنِي مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ ﴾

یوسف: ١٠١

تاسـەی دیـدار، گڕو کڵپەی ئاگرێکە، بە نـاوی لیقا نەبێ، بە هیچ شتێك دانامرکێ!

خۆ ئەوە نەبێ بە گەیشـتن بـە مەحبووب، ئیدی دڵ ئارام بگرێو لە هەژانو هەڵقرچان بوەسـتێ! بەڵکو ئـەو کاتەی نووری مەحبووب دەردەکەوێت، ئیدی مەپرسە دڵ چی بەسەر دێ!!

هەروەکو شاعیر دەڵێ:

وَأَبْـرَحُ مَـا يَكُـونُ الشَّـوقُ يَوْمـاً    إِذَا دَنَتِ الخِيامُ مِنَ الخِيـامِ.

جونەیدی بەغدادی دەڵێ: لە سەری سەقەطیم بیست، کە دەیگوت: مەقامی شـەوق بەرزترین مەقامـی عاریفانە، ئەگەر بیگەنێ؛ چونکە کاتێ دەگاتە ئەو مەقامە، ئیدی لە هەموو شتێ بێئاگا دەبێو ئاوڕ بۆ لای هیچ شتێ ناداتەوە، کە لە مەحبووبی دوور بخاتەوە!

هەر بۆیە ئەهلی بەهەشت، وێڕای ئەو هەموو نازونیعمەتە، بەردەوام بەتاسەن بۆ دیداری ئیلاهی!

ئەو هەموو خۆشـیو لەزەتەی بەهەشـت ناتوانێ تاسەی دیداریان دامرکێنێو شەوقی مەحبووبیان لا فەرامۆش بکات!

چونکە تاسـەو ئیشـتیاقی دڵ، بە خودی دیداریش دانامرکێ، ئەو کاتەی دڵ بە ئەویندار شاد دەبێ، ئیدی دەداتە قوڵپی گریانو چاویش ئەسرینی دیدار دەڕێژێ!

تاسـە کە هێنـدە گەورەیە، ناتوانێ باوەڕ بکا، ئەوا گەیشـتووە بە دیدار!



ئەو ساڵەهای ساڵە دەسووتێ، ئێستا چۆن قەناعەت بە خۆی بکات، کە گەیشتۆتە خزمەتی مەحبووب؟!

ئیبنولقەیم دەڵێت: تاســە دوو جۆرە: تاسەیەك بۆ دیدار، ئەمەیان بــە دیــدار دادەمرکــێ، بــەڵام دووەمیــان کە تاســەی ســاتی دیدارە، ئەمەیان هەرگیــز کۆتایی نایەت؛ چونکە ئەوە ئاوێزانبوونی ڕوحە بە مەحبووبەوە! ئیدی ئەوە هەتاهەتا دەمێنێ!!

ئیمامی نەسر ئابادی دەڵێ: خەڵکی هەموو، مەقامی شەوقیان هەس، وەلێ مەقامی ئیشتیاقیان نییە!

چونکــە هەرکەس بگاتە ئەم مەقامــە، ئیدی تێیدا دەتوێتەوەو ون دەبێ، ئۆقرەی لێ هەڵدەگیرێ!

عاریفان دەڵێن: ئەوەی موشتاقی خودا بێ، هەموو شتەکان موشتاقی دەبن!

ئازیزم با لێرەدا هەڵوێســتەیەك بکەین! ئەم ڕستەیە، وشەگەلێکی ئاسایی نین!

یەکەم جارە لە ژیانمدا، بەرامبەر ڕستەیەك کە سەرچاوەکەی ﴿مَن كَانَ يَرْجُوا لِقَاءَ اللَّهِ فَإِنَّ أَجَلَ اللَّهِ لَآتٍ﴾ە ، ئاوا هەست بە خەجاڵەتیو شەرمەندەیی بکەم!

ئایا ئێمە، موشــتاقی ڕاستەقینەی خوداین، یان موشتاقی شتەکان؟! لــە کاتێکدا بۆ ئەویندارێك کە لە مانای ئەوینی حەقیقی گەیشــتبێ، دەزانێ کە هیچ شتێ حەدی نییە، لەگەڵ مەحبووبدا زیکر بکرێ!!

گـەر بەتەواوی، ڕووی دڵمان بکەینە خودا، جگە لە تاسـەی دیدار، موشــتاقو چاوەڕوانی هیچ نەبین، ئەوا هەرچی هەیە، بەشـوێنماندا ڕادەکات!

زاتــی خوداوەند، ئــارەزووی لیقاو دیدارمــان دەکا، "مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللّٰهِ أَحَبَّ اللّٰهُ لِقَاءَهُ".

خۆزگە هەریەکێك لە ئێمە، لە خۆی دەپرســی: ئایا من، بەڕاســتی موشتاقی دیداری خودام؟!

ئافرەتێك، کوڕێکی لاوی لە ســەفەر بوو، کاتێــك گەڕایەوە، خزمو کەس هەموو، خۆشحاڵو سەعادەتمەند بوون بە هاتنەوەی، کەچی ئەم دەستی کردە گریان!

لێیــان پرســی بۆچی دەگریت؟! لە وەڵامدا گوتــی: گەڕانەوەی ئەم لاوە، ڕۆژی گەڕانەوە بۆلای خودای هێنامەوە یاد!!

هەموو دەگەڕێینەوە بۆ لای خودا، بەڵام چۆنو بە چی؟!

دەتوانین بیلال ئاسا، لە دواساتەکانی مەرگدا، بە چرپەی لێوەکانمان بجووڵێنینو بڵێین:

غَـــداً نَـلــقـى الأَحِــبَّـــة.. مُــحَــمَّـــداً وَصَــحــبَــهُ

بەخودات دەسپێرم...

نیوەڕۆیەکی گەرمە، سەرەتا ڕۆژەکانی مانگی پیرۆزی ڕەمەزانە، گڕەی هاوین وەك هەڵاوی ئاگر، سیمای ڕوخسار دەژاکێنێ!

بە لێوی وشكو سەری کزو هەنگاوی وردەوە، پۆل پۆل خۆشەویستانی خودا، بەرەو دیوانی دڵو قیبلەی ئەوین، هەنگاو دەنێن!

کاروانی خەیاڵ، بەرەو کوچەو کۆڵانی مەدینەی مونەووەرەی بردم، ئەو ڕۆژانەی کە پەروانەکانی دەوری شەمی درەوشاوە، چۆن بە گەرووی وشكو ڕەنگی زەردو سكی برسیەوە، لە دوای پەیامبەری نازدارەوە، نوێژی ڕۆحو سەفی بەندایەتییان دادەبەست، دەچوونە نێو دەفەری نوورو فرمێسکەکانیان لەسەر خۆڵی مەدینە، گەورەترین ڕۆمانی ئەوینو تاسەی خۆشەویستییان تۆمار دەکرد!

فەرشی مزگەوتی مەدینە خۆڵ بوو، وەلێ لای ئەوان، فەرشی فیردەوسو میسكو زەعفەرانی جەننەت بوو!

سەقفی مزگەوت پەلکەخورما بوو، وەلێ ئەوان لەژێر سێبەری عەرشدا، واژۆیان لەسەر گرێبەستی ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ دەکرد!!

بەڕۆژووبوون، بەڵام نەیاندەزانی ئێوارە بە چی فتار دەکەن؟ چی دەخۆن!

چونکە ئەوان، خەیاڵیان لای بەربانگ نەبوو، بەڵکو خەیاڵیان لای ڕەزامەندی ئەو خودایە بوو، کەتا ئەو فەرمان نەکا، لێو ناخەنە سەر لێوی پەرداخە ئاوێك!!

ئەوان چێژی خۆشەویستی خودا، هەموو شتێکی لەیاد بردبوونەوە!



حارســی موحاســیبی دەڵێ: «ئەگەر خەڵکی هەســتیان بە لەزەتی خۆشەویســتیی خودا کردبــا، ئەوا خــواردنو خواردنــەوەو تەماحی دنیایان کەم دەبوو، نابینن فریشتەکان، بە خۆشەویستیی خودا، هەموو شتێکیان فەرامۆش کردووە!

ئازیزم: ئێمە لە بەیانی ڕا، خەممان سفرەی بەربانگە، چی بکڕینو چی ئامادە بکەینو چی بخۆین!

وەســتانی چەند خولەکێکمان لا زۆرە، لە نوێژی تەراویحدا، وەلێ کاتژمێرێك وەستانمان لە فرۆشگەیەکدا، یا بۆ کولێرەیەکی گەرم، زۆر پێ ئاساییە!

ڕۆژوو لای ئێمەو لای پێغەمبەرو یارانی، زۆر جیاوازە!

پێغەمبەر (دروودو ســلاوی خودای لێ بێ) ئێواران جگە لە چەند دەنکە خورمایەك، هیچی دی بەدی نەدەکرد!

زۆر جار ئەوەشی دەست نەدەکەوت، تەنها بە قومە ئاوێك گەرووی وشکی تەڕ دەکرد!

لە دواییشدا دەیفەرموو: «ذَهَبَ الظَّمَأُ، وَابْتَلَّتِ الْعُرُوقُ»

تۆ لەســەر خوانی ئەوینداری ڕۆحتی، جگە لە پەرداخێ ئاو، چیت دەوێ!

شیرینکردنی نێودەم شتێکەو شیرینکردنی ڕۆح شتێکی دی!

تەڕکردنی لێو شتێکەو چەورکردنی گەدە شتێکی دی!

ئەوان بە دەنکە خورمایەك، دەبوونە میوانی فەرحەی ئیلاهی!

ئێمەش خۆزگە دەخوازین، لە جێگای خۆمان هەڵنەسینو بخۆین، هەر بخۆین، تا دەمرین!!

تاوس کوڕی کەیسان دەڵێت: شیرینیی دونیا، تاڵیی ئاخیرەتەو تاڵیی دونیاش شیرینی ئاخیرەتە!

ئێمە لەسەرەتای ڕەمەزان، خەمی خۆراكو خواردنی ڕەمەزانمانەو لە نیوەی بە دواوەش، خەمی جلو جەهازی جەژن!

ئاوا دەمانەوێت لە عوتەقای ڕەمەزان بین؟!!

سکاڵاش دەکەین کە هیچ شتێك تامی نەماوە، تەنانەت عیبادەتیش!

لە وەهیبی کوڕی وەردیان پرسی: ئەوەی تاوان ئەنجام بدات، تامی عیبادەت دەکا؟

گوتی: نەخێر، ئەوەش کە دەیەوێتو هێشتا نەشی کردووە!!

ئازیزم: ئەو هاوەڵە شەیداو ئەڤینداراتە، شەوان تا سەحەر، ئاوێتەی هەنسكو قوڵپی گریانو ناڵەو نرکەی نیوەشەو بوون، دواساتەکانی سەحەریش بە بەرۆکی تەڕو دەستی لەرزیوو گڕی تاسەوە، بە ئیستیغفار گوڵاوپرژێنی ژوانی دڵیان دەکرد!

لەگەڵ سەدای ﴿وَٱلۡمُسۡتَغۡفِرِينَ بِٱلۡأَسۡحَارِ﴾دا، بە دوو سێ دەنکە خورماو جامێ ئاوی گۆزەیەکی گڵین، گرێیان لە دەروازەی هەموو ئارەزوو و شەهەواتیان دەداو جگە لە زیکرو یادی خودا، ئیدی سەرقاڵی هیچی دی نەدەبوون!

دەزانم خۆشەویستانی خودا، غەریبو نامۆن لەم سەردەمەدا، بەڵام

هەروەکو پەیامبەر دەفەرموێ: «فطوبى للغرباء»

هەلگرانــی پەیامی نوور، خۆشەویســتانی خــوداو هەوادارانی ڕێگای ڕاستو سوننەتی پێغەمبەرو زاهیدانو دونیانەویستان، نامۆن!

زۆریش نامۆن .....

بەڵام ئەوەی خودای لەگەڵ بێ، نامۆ نییە، ئەوەی چاوی لە دەســتی خودا بێ، بێکەس نییە، ئەوەی دڵی دابێتە دەســت خودا، لە هیچی کەم نییە!

دەگێڕنەوە: کاتێك مووســا پێغەمبەر (درووودو سڵاوی خودای لێ بێ) لە فیرعەون هەڵدێو ڕوو دەکاتە مەدیەن، بەو شێوەیەی کە خودا باسی دەکات، لــە خودا دەپاڕێتــەوەو دەفەرموێ: خودایــە.. تەنیاو نەخۆشو نامۆم!

خودای گەورەش پێی فەرمووو:

ئەی مووسا.. تەنیا، ئەو کەسەیە کە هاودەمێکی وەك منی نەبێ!

نەخۆش، ئەو کەسەیە، کە شیفابەخشێکی وەك منی نەبێ!

نامۆ، ئەو کەسەیە، کە لە نێوان منو ئەودا، مامەڵەیەك نەبێ!

وریابە ئازیزم، وریابە!

با تێکەڵ بە ئەهلی دونیا نەبین.. خۆ ئەمڕۆ، جگە لە ئەهلی دونیا، کەسی دی نابینرێ!

مەحوی دەڵێ:

ئەوەنـــدەی ئەهلـــی دنیـــان ئەهلـــی دنیـــا، تاقـــە ڕۆژێ گـــەر بـــە قەڕنـــێ مـــن ئەوەنـــد ئەهلـــی خـــودا بـــم، دەبمـــە پێغەمبەر

بەڵام دەبێ ئێمە، هەر هەوڵی ئەوە بدەین، کە ئەهلی دنیا نەبین!

حەسەنی بەسـری دەڵێ: **باوەڕدار لە دونیادا، وەك ڕێبوارێکی نامۆیە، خەم ناخوا بۆ نزمی دنیاو کێبەرکێش ناکا لەبەرزی دنیـــادا، خەڵك لەو ســـەلامەتن و ئەمیش ماندووی دەســـتی نەفسی خۆیەتی.**

**پێغەمبـــەری نازداریـــش دەفەرمـــوێ: ئایا پێتـــان بڵێم: پاشاکانی بەهەشت کێن؟!**

**هەموو ســـەرکزو لاوازێکـــی تۆزاوی، جـــلو بەرگی دڕاوو نەناسراو، بەڵام ئەگەر سوێند بخواو لە خودا داوا بکا، خودا سوێندەکەی بۆ جێبەجێ دەکا!!**



دواسـاتەکانی کۆتا شـەوی ڕەمەزانی پیرۆزە، هەسـت بە خەمێکی قووڵ دەکەم.. مامۆستا هیچ شەوێك ئاوا، هەستم بە تەنیاییو نیگەرانی نەکردووە!!

تـۆ دەزانـی، ڕەمەزان بـۆ من، دونیایـەك یـادگاریو ئەلبوومێك یادەوەریی خۆشو بێوێنەیە!

هەسـت دەکەم ئەمشـەو، میوانێکی ئازیز جێم دەهێڵێو ماڵاواییم لێ دەکات!

بە دوی خۆیدا، کۆمەڵێ وشە جێ دێڵێ، کە بۆ منی زێدە هەستیار، زۆر ئەستەمە!

ماڵاوایی، دوعاخوازی، تەنیایی، چۆڵبوونی هەوارو ئاوابوونی، گوڵو عەبیری خۆشەویستێك!

چی دەبوو، ئەگەر جێت نەهێشتبام!

ئیدی من شەوانە، لە چ میحرابێکا نزا بکەم؟

کێ لە سـەحەرا بە ئاوازێ نەرمتر لە ئاوریشـم، بانگم بکاتە سەر خوانی پارشێوی ئەوینی خودایی؟

ئێواران کێ لەگەڵ دەنکێ خورمادا، شـیرینی ببەخشێ بە ڕۆحمو خۆشیو فەرحەی ئیلاهی بکاتە خەڵاتی دڵم؟

شەوانە لە دەرگای چی ماڵێ بدەم؟ ئیدی دیوەخانی دڵم دادەخرێو چرای ژوانی شەو دەکوژێتەوە!

چەند جیهانێکی ئەفسووناوی بوو مامۆستا، منو قورئانو بەرماڵەکەم!



هاوڕێی هەمیشەیش، ئەسرینی چاوی خەجاڵەتم!

بێ ئەو شەوە نووریانانە چی بکەم؟!

ئازیزم، ئێمە نابێ تەنها کاتی ماڵاوایی بۆ ئازیزانمان بگرین‌و هەست بە چۆڵیی شوێنەکەیان بکەین!

دەبێ هەمیشــە لەنێو دڵمان بژین‌و لێمان جودا نەبنەوە. هەمیشــە میوانی ڕۆحمانبن‌و هاودەمی ساتەکانی ژیانمانبن.

ماڵاوایی لە وەرزی گوڵاوپرژێنی دڵەکان‌و ژوانی ڕۆح سەختە!

لەیادکردنی ئەو ســاتانە ئەستەمە، کە دڵ دەگاتە دامێنی عەرش‌و چاو لەگەڵ ئەستێرەکانا، بۆ ڤیستیڤاڵی ڕۆح، بە فرمێسکی پەشیمانی، پەیامی فریشتەیی تۆمار دەکات!

لەیادکردنی ئەو ساتانە سەختن، کە بەندە لە بەیانەوە، تا ئێوارێ، چاوەڕوانی ئیزنی مەحبووبە؛ بۆ قومێك ئاوی سارد!

شــەوانی قەدرو ئەسراری بەدرو بەیداخی ئەسر، لە دیدەی خەیاڵ ناچنە دەر!

ناڵەی نیوەشــەوو ئیستیغفاری ئەســحارو خوانی سەحوری مەولای دڵ، چۆن لەیاد دەکرێ؟!

بەڵام نابێ، هەر لەگەڵ یادگارییەکاندا بژین‌و ژیان فەرامۆش بکەین.

با هەموو ساتەکانی ژیانمان، بکەینە یادەوەری خۆش‌و بە مەرەکەبی نوور، لە پەڕاوی تەمەنماندا، جوانترین کردارو گوفتار تۆمار بکەین!

با هەمیشە خاوەنی دڵە پاك‌و بێگەردەکەی ڕەمەزان بین!

با هەمیشە، خاوەنی سۆزو میهرو بەزەییەکەی ڕەمەزان بین!

ئەو چاوانەی کە بە تارای شەرمو شکۆ لە خوداوەند داماپۆشیبوو،

ئیدی جارێکی دی، بۆ شتێك پێی نەڕوانین، کە خودا پێی خۆش نییە!

بـــا ئەو لێوانەی کە بـــەردەوام، خەریکی زیکرو یادی خودابوون، لە

ئاوازی خۆیان نەسرەوون!

با ئەو هەنگاوانەی بەرەو ماڵەکانی خودا دەڕۆیشتن، وچان نەدەن!

لـــە ڕەمەزاندا، دڵمان لە پەڕەی گوڵ ناســـکتربوو، با ڕێگە نەدەین

تاوان بیکاتەوە بە بەرد!

لە هەموو ڕقو کینەیەك پاکمان کردبوونەوە، با ئیدی جارێکی دی

نەیکەینەوە بە هێلانەی ئەهریمەن!

لـــە ڕەمەزاندا، ئازاری کەســـمان نەدەدا، غەیبەتی کەســـمان نەدەکرد،

گۆشتی کەسمان نەدەخوارد؛ بۆئەوەی ڕەنج بەخەسار نەبین!

ئیمامی شافیعی دەفەرموێ: (بِئْسَ الزَّادُ إِلَى الْمَعَادِ الْعُدْوَانُ عَلَى الْعِبَادِ.)

خراپترین توێشوو بۆ قیامەت، ستەمو دوژمنکاریی بەندەکانە!

هەروەها دەفەرموێ: (مَنْ أَرَادَ أَنْ يَقْضِيَ اللهُ لَهُ بِالْخَيْرِ فَلْيُحْسِنْ الظَّنَّ بِالنَّاسِ).

واتـــە: ئەوەی دەیەوێ، خودا بە چاکـــە، مامەڵەی لەگەڵدا بکات، با

گومانی باش بە خەڵکی ببات.

خۆ ئەوەی ئێمـــە لەبارەی خۆمانەوە دەیزانین، لەبارەی کەســـەوە

نایزانین، کەواتە: بۆچی گومانی باش، بە خەڵکی نەبەین؟!

کابرایەك لای مەعرووفی کەرخی دانیشتبوو، غەیبەتی کابرایەکی کرد.

پێی گوت: فلان، بیری ئەو ڕۆژەت هەبێ، کە لۆکە لەســەر چاوت دادەنرێو بەتەنیا دەخرێیتە گۆڕ!

لە ڕەمەزاندا، مردنمان باش لە یادەو زۆر بە چاوێکی کەم، تەماشای دونیا دەکەین!

خۆمان بۆ سەفەری یەکجاری ئامادە دەکەینو خۆمان لە دونیاویستی دەپارێزین!

پشتمان لە دونیاو ڕوومان لە ئاخیرەتە!

لەوێــدا، خۆمان بە دەوڵەمەندترین کەســی دونیــا دەزانین، کۆڵی قورسی دونیا دادەنێینو دڵمان پڕ دەبێ لە شادی!

غەرقــی دەریای نوورو شــنەی فەیزی ئیلاهی دەبیــن، دیوەخانی دڵمان، وەك چراخانی شەوانی تەراویح ڕووناکە!

نیگامان شەرمن، سیما پەشێوو پەشیمان!

ساتەکانی تەمەن بە هادار!

هەموو چرکەیەکی، کانێکە لە ئاڵتوون..

یــادە، تیلاوەیە، ئیســتیغفارە، فەرمانــە بە چاکە، دەســتوورە بۆ قەدەغەکردنی خراپە!

هێمنی سەکینە، ویقار، ئارامی، ئۆخژنی دڵ، سەعادەتی بێسنوور!

بــا ئــەم هیممەتە، بــەردەوام بێ ئازیــزم، ئەم پەیمانــەی لەگەڵ خوداوەندا بەستمان، نەیشکێنین!

ئێمە، گەردنمان دایە دەست خوداوەند؛ تا لە دۆزەخی ئازاد بکات..

ئێمە، لە ڕیزی «عتقاء»دا، خۆمان ناونووس کرد!

ئێمە چاوەڕێی کلیلی «ڕەییان» بووین..

ماڵاواییمـــان کرد لە ڕەمـــەزان، بەڵام ماڵاوایی لـــە تەوبەو ڕیزوانی ئیلاهـــیو چـــرای ئیمانو تـــارای تەقـــواو قەڵغانی عەفـــافو بەیداخی بەندایەتی ناکەین!

لە ڕەمەزاندا دەژین.. نەك تا ڕەمەزانێکی دی..

بەڵکو تا «فەرحەی دووەم»، تا لیقای ئیلاهی.

مامۆستا، لە گێژاوی ئەم سەردەمە دژوارەدا، کە مرۆڤەکان ڕۆژبەڕۆژ، هەموو ڕێزو بەهایەك، دوابەدوای یەك لەدەســت دەدەنو خۆیان لەنێو گێژەڵۆکــەی ســەرگەردانیدا نوقم دەکەن، باوەڕدار هەســت بە چێژی ئیمانوبەرزیو بڵندیی ژیان دەکا لە سایەی بەرنامەکەی خودادا!

چی جیهانێکی ســەیرە، کاتێك دەچیتە سەر بەرماڵو ڕۆحت بەرەو عەرشی مەزنو مەلەکووتی ئەعلا هەڵدەکشێ؟!

چی ســەعادەتو خۆشــیو لەزەتێکە، کە دڵ لە تاوا، دێتە لەرزینو چاو ئەسرینی خۆشی دەڕێژێو ناخ دێتە سەما!

لەوێدا، هەست بە لەزەتێك دەکەی، کە بە هەموو موڵكو سەروەتی دونیا، سەودا ناکرێ!

کاتێك بەندەکان، وەشوێن بەندەی وەکو خۆیاندا ڕادەکەنو دڵیان، بە مەتاعی دنیای فانی خۆش دەکەنو فرمێسك، بۆ خۆشییە سەرابئاساکانی دنیــای فانی دەڕێژن، تــۆش دڵت ئاوێزانی نووری خوداییەو ڕۆحت لە کووچەو کۆڵانی بەهەشتا دێتو دەچێ!

کاتێك مرۆڤەکان، ڕێگای ڕاســتیان ون کردووەو سەریان لێ شێواوە، تۆش بە ڕاســتە شەقامی «مســتقیم»دا، بەرەو لای خوداوەند، هەنگاو دەنێی!

ئــەو کاتەی پەڵەی ڕەشــی تــاوان، ڕووناکی ڕوخســارەکان دەدزێو تەپوتۆزی فەسادو فیتنە، نێوچەوانەکان گرژ دەکا!

تەماشــای ڕوخســاری نوورینی ئەهلــی ئیمان کە، ئەوســا دەزانی



مەحرووومان لە نوور، جەند بەستەزمانن!!

﴿ وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ ٱللَّهُ لَهُۥ نُورًا فَمَا لَهُۥ مِن نُّورٍ ﴾ النور: ٤٠

چی بلێیم، ماۆستای خۆشەویستم: لە سوپاسی خودایەکدا، کە دەستی گرتین بۆســەر ڕێگای نوور، چاوانی ڕشــتین بە کلــی فەرموودەکانی، ســیمای ســپی کردین بە ســوژدەبردن بۆ جەمالو جەلالی! چی بلێیم خودایە، تۆ نەبای، من ئێستا لە کام تاریکستاندا، پەلەقاژەم دەکرد؟!

ئازیــزی من، مرۆڤ هەرگیز ناتوانێ سوپاســی خودای گەورە بکات لەســەر نیعمەتی ئیمــان؛ چونکە ئــەوە، تەنها خەڵاتێکــی خودایی‌و ئیختیارێکی ئیلاهییە!

خودا بە لوتفو میهرو خۆشەویســتیی خــۆی، لەنێو بەندەکانیدا، کەســانێك هەڵدەبژێرێ‌و نووری ئیمان دەخاتە نێو دڵیان، ئەم کارەش بەخودا نەبێت، بە کەس ناکرێت، تەنانەت بە خۆشەویسترین بەندەی خوداش!!

ئــەی نابینی: پەروەردگار، بە پێغەمبەری نازدار دەفەرموێ: ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَآءُ ﴾ القصص: ٥٦

کەواتــە: تۆ بە ویســتی خوداوەند، نێوت هەڵبژێــرا، بۆ نێو ڕیزی کاروانی نوور! هەڵگرانی چرا، دراوسێکانی خودا لە بەهەشتا!

ئای ئەم ئیختیارە، چەند گەورەیە!

مرۆڤ سەرســام دەکا! خاوەنی ئەم خەڵاتــە لە کوێیەو بیر لەچی دەکاتەوەو چۆن دەژی‌و چاوەڕوانی چی دەکات!!

بۆ چەند ساتێك، چاوەكانت لێك نێ!

با بەدڵ گەشتێك بكەین بۆ هەزاران ساڵ پێش ئێستا!

خەڵكی بە ئاواتی ئەوەن، دەستیان لە دامێنی «فیرعەون» گیر بێ،

غولامی بەر دەرگاكـــەی بن، بەڵام بزانین خێزانەكەی چی دەڵێ؟ چی

داوا دەكا؟ دڵی بە كێوە پەیوەستە؟!

﴿ رَبِّ ٱبْنِ لِي عِندَكَ بَيْتًا فِي ٱلْجَنَّةِ ﴾ التحريم: ١١

بێئاگا لە كۆشكو تەلاری فیرعەون!

لە نازونیعمەتی شاژنیی! لە خۆشیو مەتاعی دونیا!

دڵ وا لە ئاسمان، ڕۆح وا لە جینان!

چی داوا دەكا لە خۆشەویستی خۆی، ماڵێك لەكوێ؟ لەلای خۆی لە

بەهەشت، نزیك لە عەرشی خودا!

ئەو ئافرەتە، تەنها لاشـــەی لە كۆشكی شـــایە، ڕۆحو جەستە، وەكو

پەروانە، لە ئاسمانی حەوتەمن، بەدەوری عەرشا دەخولێنەوە.

لە ماڵ دێمە دەر، ماڵان جێ دێڵم

تا بەنهێنی، ناوی تۆ بێنم -مەجنوون-

ئازیزم: دووری لە خوداو دەردی غەفڵەتو مردنی دڵو لەیادچوونی

ڕۆژی دواییو ڕاكردنو بەشـــوێن ســـەرابی دنیـــادا، ژیانی حەقیقی، لە

مرۆڤەكان سەندووەتەوە!

ئەوان تەنها وەكو گیانلەبەرێك زیندەگی دەكەن، هیچی دی نا!

حەیاتی حەقیقی، ژیانی ڕاستەقینە، تەنها لای هەڵگرانی مەشخەڵی نـووره!﴿ أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُورًا يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا ﴾ الأنعام ١٢٢

ئایا کەسێك، کە بێگیان لە گومڕاییدا، سەرلێشێواوو داماو بوو. بەڵام دڵمـان بـە ئیمان زیندوو کردەوەو هیدایەتمـان دا بۆ نووری ئیلاهیو ڕێگای ڕاسـتی پەیامبەران، وەکو ئەو کەسە وایە، کە لەنێو تاریکستانی گومڕاییدا، پەلەقاژە دەکاتو ناتوانێ لێی دەرباز بێت؟!

ئەهلی حەیاتی حەقیقی ئازیزم وەکو ئیمامی هەرەوی دەفەرموێت، بە سێ هەناسە دەژین:

١. هەناسەی ترس: لە خودا، هەیبەت لە پەروەردگار، پەیوەستبوونی دڵ بـە فەرمانی ئەو خـودا گەورەیەو یادی ئاخیـرەتو ڕۆژی دادگای ئیلاهی.

٢. هەناسـەی هیواو ئومێدو ڕەجا: بە تەماشاکردنی بەڵێنی خوداو خەڵاتـی ڕۆژی دوایی، بۆ بـاوەڕداران و گوزەرکردن بە ڕۆح، لەنێو باخو گوڵزاری بێوێنەی بەهەشتدا!

٣. هەناسـەی خۆشەویسـتیی خودا: بە ئاشـنابوون بە ناوی جوانو سیفاتی بەرزی ئیلاهی بە لێوانلێوبوونی دڵ، بە خۆشویستیو جەماڵی خوداییو بەرزیو بڵندیو هێزو دەسەڵاتو میهرو بەزەیی بۆ بەندەکانی.

کاتێك گوناهەکانی دەکەوێتە یاد، هەناسەی ترس هەڵدەکێشێ!

کاتێك بەزەییو میهری خوداو بەخشـندەییو لێبوردەیی بێسنووری خودایی دێتەوە یاد، هەناسەی ڕەجا هەڵدەکێشێ!

کاتێکیـــش جەلالو جەماڵو کەماڵو ئیحســانو فەیزی بێکەوشــەنی خودایی دێتەوە یاد، هەناسەی خۆشەویستی هەڵدەکێشیێ!

ئەم هەناسانەش، ترازووی ئیمانن، با ئیمانی خۆمانی پێ بکێشین!!

پلەیەك لە سەرووی ئەم حەیاتەش، حەیاتی کۆبوونەوەی ڕۆح، لەبەر دەســتی خودادا، بەشــێوەیەك وەکو ئاسیە، هیچ خەمێکی نییە، جگە لە گەیشتن بە خودا.

هەناسەکانی ئەم ژیانەش، هەر سیانن:

١. هەناســەی ئاتاج بە خودا: بەشێوەیەك کە هیوایەکت ببڕێ، تەنها بە خودا نەبێ! بە ڕۆحو دڵو لاشە، تەنها موحتاجی خودا بیت!

جگە لە خــودا ڕوو نەکەیتە کەسو ڕازونیازو تکاو ڕجات، نەخەیتە بەر دەستی کەس!

٢. هەناســەی هــەژاری بۆ لای خــودا: بەشــێوەیەك تەنها خۆت بە هەژاری بەر دەرگای ئەو بزانیت، ئەمەش لوتکەی دەوڵەمەندییە!

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِ ۖ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴾ فاطر: ١٥

ئەوەی تۆ داوای لێ دەکەی جگە لە خودا، هەژاری لای خودایەو هەر داوا لە خودا دەکا، ئەوەی داوای بەخشــینی لێ دەکەی، هەر دەبێ خودا پێی ببەخشێ!

کەواتــە: دەوڵەمەندترین کەس، ئەو کەســەیە، کە تەنها هەژاری لای خودا بێو لە بەردەستی خودادا نەبێ، هەرگیز خۆی بە هەژار نازانێ!

٣. هەناسەی شــانازیو ئیفتیخار: کاتێك باوەڕدار، هەست بە قوربی



ئیلاهیو هۆگربوون بە جەلالو جەمالی دەکاو دڵی پڕ دەبێ لە خۆشیو سرووورو سەعادەت، هەناسەی شانازی هەڵدەمژێو لە خۆشیدا، شا بە سەپان ناگرێ.

وَمِمَّا زَادَنِي شَرَفًا وَتِيهًا وَكِدْتُ بِأَخْمُصِي أَطَأُ الثُّرَيَّا

دُخُولِي تَحْتَ قَوْلِكَ: يَا عِبَادِي وَأَنْ صَيَّرْتَ أَحْمَدَ لِي نَبِيًّا

جا جگە لەم ژیانە، ئیدی ژیان هەیە؟! ئەوەی ئاوا، لەگەڵ خودادا نەژی، ژیانی هەس؟! یان مردووەو بەشی زیندوو دەخوا!

ڕاستی بۆ خوداوەند، کە دەفەرموێ: ﴿ أَمْوَٰتٌ غَيْرُ أَحْيَآءٍ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ﴾ النحل: ٢١ ئەوانە مردووی بێ گیانن، ناشزانن کەی زیندوو دەبنەوە!

چاومان لە دەرگای خودایەو بەئومێدی ئەو ژیانە بەرزەین، خودا بە لوتفی خۆت، لەو نوورە، مەحرووممان مەکەو لەو ژیانە، بێبەریمان مەکە!

دڵنیایی نابێتە هاودەمی ڕۆح، ئاسـوودەیی نابێتە ساکینی مەنزڵی دڵ، تا بەتەواوی تەسلیمبوون، جڵەوی دینو ژینت، تەسلیم بە خودای گەورە نەکەیت!

ئەو کاتەی هەموو کاروباری ژیانت، دەدەیتە دەسـت خودا، ئەو کاتە دڵنیا دەبیت، کە هەموو کارەکانت، بەدەست ئەونو ئەویش بە حیکمەتو ڕەحمەتو میهری بێسنوورەوە، مامەڵە لەگەڵ بەندەکانیدا دەکات!

ئیدی هەرگیز خەم نابێتە میوانی دڵە پاکەکەت!

ئەو کاتەی پشت بە خودا دەبەستیتو لەژێر سایەی پڕمیهرو سۆزی ئـەودا، پشـوو بە ڕۆحت دەدەی، ئیدی خەمو پـەژارە، هەرگیز ڕێگای دەروونت نادۆزنەوە!

خوداوەنـد، داوامـان لێ دەکات، دەسـت بەهێزی ئـەوەوە بگرینو تەنهـا خۆمـان بهاوینە نێو دەفەری میهری ئەوو جگە لەو، پشـت بە کەس نەبەسـتین؛ چونکە جگە لەو خوداوەندە گەورەیە، یارو یاوەرو یارمەتیدەرێکمان نییە!

جا چی سوڵتانو مەولاو پاڵپشتو هێزدارو یارمەتیدەرێك لە "الله" باشترە؟! ﴿وَٱعۡتَصِمُواْ بِٱللَّهِ هُوَ مَوۡلَىٰكُمۡۖ فَنِعۡمَ ٱلۡمَوۡلَىٰ وَنِعۡمَ ٱلنَّصِيرُ﴾ الحج: ٧٨

کەسـێك ڕووگـەی خـودا بێـتو هێزی ئەژنـۆو بڕبڕەی پشـتی، تەسـلیمبوونو دەسـتگرتن بێ بە هێزی خوداوە، ئیدی سـەرکەوتنو سەرفرازی، دەبنە هاودەمی هەمیشەییو دەبێتە ڕێبواری ڕێگای نوورو هیدایەت.

﴿ وَمَن يَعْتَصِم بِاللَّهِ فَقَدْ هُدِيَ إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾ آل عمران: ١٠١

چونکە کاتێك خودا دەکەی بە وەکیلی خۆت، ئیدی ﴿ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ وَكِيلًا ﴾

النساء: ٨١

کاتێـــك خـــودا دەکەی بە ســـەرچاوەی ڕزقو ڕۆزیو بەخشـــندەیی بێسنووری هەموو خەڵاتەکان، ئەوا تۆ، ئیدی قەیرانێك نییە، هەڕەشە لە ئابووریت بکات؛ چونکە خودای تۆ:

﴿ إِنَّ اللَّهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينُ ﴾ الذاريات: ٥٨

کاتێـــك پشـــتی پێ دەبەســـتی، ئەو خودایـــە بـــەردەوام دەتبینیو دەتبیستیو ئاگای لە هەموو ڕازونیازێکتە، بە هێزو دەسەڵاتو زانستو بیســـتنو بینینی، لە هەموو شوێنێ لەگەڵتایە ﴿ وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ ﴾

الحديد: ٤

ئازیزم: دەســـتگرتن بەهێزی خوداو پشتبەســـتن بەخـــودا، دەبێت سەرەتا تەوەککولو تەسلیمبوون بێت بە وەحیی ئیلاهیی، کە قورئانو سوننەتی پەیامبەرە «سڵاوی خودای لێ بێت».

دینـــی خـــودا، هەمـــووی تەســـلیمبوونو ئیعتیصامو دەســـتگرتنو ملکەچبوونە!

بە کردارو بە گوفتارو بە نیەتو بە ئامانجو بە ئیخلاســـی تەواوو شوێنکەوتنی پەیامی پێغەمبەرەوەو بەردەوامبوون لە سەری، تا ڕۆژی لیقای ئیلاهی!

تەماشـــای باوکی پێغەمبەران ئیبراهیم بکە «ســـڵاوی خـــودای لێ بێت»،

کاتێك خوداوەند، فەرمانی تەسلیمبوونی پێ دەکات، چی دەفەرموێت؟! ﴿ إِذْ قَالَ لَهُۥ رَبُّهُۥٓ أَسْلِمْۖ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ البقرة: ١٣١

تەسلیمبوون بە خودا، واتە: ڕووگەی مەبەستت، تەنها خودا بێت، جگە لە خودا، مەبەستو مەرامت، بە کەس نەبێت.. چاوەڕێی لوتفی کەسو دەستی کەسو فەیزی کەس نەکەی، جگە لە خودا!

ویستت، ئیرادەت، تکاو داواو نزاو حەزو ئارەزووت، ترسو خۆشەویستیو ئاواتو هیواکانت، هەموو دابێ بە خودا، خوداو بەس!

گەر ئەوەت کرد، ئیدی پشتێنت بکەوەو لەژێر داری بەختەوەریو ڕاحەتی ڕۆحدا، بە تەواوی ڕاحەت، پشوو بدە!

ئیدی خەمی چیتە؟ کە دەزانیت "ولا یکون إلا ما یرید" وەکو ئیمامی تەحاوی لە عەقیدەکەیدا دەفەرموێت!

ئیدی لە کێ دەترسیت؟ کە دەزانیت، کاتێك خودا بیەوێت، تووشی خێرێکت بکات، کەس ناتوانێت دەستی بگرێ!

﴿ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَآدَّ لِفَضْلِهِۦ ﴾ یونس: ١٠٧

لە هەندێ ئەسەردا هاتووە، کە خودای گەورە فەرموویەتی: «بەندەکەم، داوام بکە، دەمگەیتێو من بەدەست دێنی، ئەگەر منت بەدەست هێنا، ئیدی هەموو شتێکت دەستکەوتووە، ئەگەر منیشت لەدەست چێ، ئەوا هەموو شتێکت لەدەست داوە»!

ئازیزی من، لەوە باشتر چییە، کە تۆ ئیدی کلیلی خەزێنەی دڵت بدەی بە خوداو خەمی هیچت نەبێت!

دڵنیابیت لەوەی، ئەوەی کە دەتەوێت، لە خودی خۆت زۆر باشتر، بۆت ئەنجام دەدات.

کاتێـــک کارێکت بۆ دەکات، یاخـــود بەپێچەوانەوە بۆت ناکات، ئەوە لەبەر حیکمەتێکە، کە تەنها خۆی دەزانێت!

ئێمـــە هەرچەنـــدە وێڵـــی ســـوودو بەرژەوەندی خۆمان بیـــن، تەنها ڕووکەشی ڕووداوەکان دەبینین، بەڵام خوداوەند جیهانی غەیبـو پەنهانی لێ دیارەو ئەوەی ئەو دەیزانێو دەیبینێ، ئێمە نایزانینو نایبینین!!

﴿ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ﴾ البقرة: ٢١٦

خاوەنی هێزو دەسەڵاتێکی هێندە بێسنوورە، هیچ شتێك لە فەرمانی دەرناچێت!

ئیدی بۆ بە تەواوی تەسلیمبوون، خۆمان تەسلیم بە خودا نەکەین؟ تـــا خوداوەند، لە ڕیـــزی باوەڕداراندا هەژمارمان بکاتو پاداشـــتو خەڵاتی گەورەمان بۆ دابنێ:

﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ وَأَصۡلَحُواْ وَٱعۡتَصَمُواْ بِٱللَّهِ وَأَخۡلَصُواْ دِينَهُمۡ لِلَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ وَسَوۡفَ يُؤۡتِ ٱللَّهُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴾ النساء: ١٤٦

مەرجی ســـەرەکیی ئیعتیصـــامو تەســـلیمبوونیش، بەردەوامبوونە لەسەر ئەم شارێگا ڕاستەو دەستبەردارنەبوونی ئەم پەیامە پیرۆزەیە، تا ئەو ڕۆژەی بە باوەڕەوە دەگەڕێینەوە دیوانی خودا.

لەژێر پرووشـــەی بارانەکەدا، بەرەو مزگەوت هەنگاوم دەنا، سەدای دەنگی "الله اکبر"، هاوڕێ بە شنەبایەکی هێمن و ئەو نۆبارانەی پایز، گوڵاوپرژێنی ڕۆحیان دەکردم.

هەستم دەکرد، ئاسمان هێندە نزیکە، خەریکە هەورەکان، سینگیان لــە منارەی مزگەوتەکە دەخشـــێ. هەســـتم دەکرد، بـــاران گوزارش لە بارینی ڕەحمەتی خودایی دەکات.

هەستم بە خەجاڵەتییەکی گەورە کرد، لەبری خۆم و لەبری هەموو ئەو مرۆڤانەی کە ڕۆژانە، ئەم سەرزەوییە گوناهباران دەکەن و خوداش ڕەحمەتبارانیان دەکا!!

وای خودایە لە میهری بێسنووری تۆو ڕووزەردیی ئێمەی بەندە!

لە ڕۆژی عارفەدا، گوناهی دوو ســاڵ و لە عاشووراشــدا، ساڵێکمان بۆ دەسڕیتەوە!

چی کەرەمێکی بێسنوورو چی دەریایەکی بێبنی میهرە، ئیلاهی!

ئای ئازیزم: خوداوەند، نەك بەندە تاوانبارەکان، بێهیواو سەرگەردان نـــاکا، بەڵکو چاوەڕوانی گەڕانەوەیانە! "تـــەوواب" دەیەوێت، تاوانباران تۆبە بکەن!

دەگێڕنـــەوە: خـــودای گەورە، سرووشـــی نـــارد بـــۆ داود پێغەمبەر (دروودی خـــودا لێ بێت)و پێی فەرمـــوو: ئەگەر یاخییەکان، ئاگاداری شـــەوق و تاسەو ئارەزووم بۆ گەڕانەوەیان دەبوون، دەتوانەوە لە تاسەی گەڕانەوە بۆ لای من!

ئەی داود، ئەمە ویستی منە بۆ یاخییەکان، ئەی دەبێ خۆشەویستیم بۆ ئەو کەسانە چۆن بێ، کە ڕوویان کردۆتە من؟!

لە زەمانی مووســا پێغەمبــەردا (دروودی خودا لێ بێت)، بێبارانیو وشکەساڵی، تەنگی بە بەنی ئیسرائیل هەڵچنیبوو، مووساو قەومەکەشی، بۆ نوێژەبارانە چووبوونە دەرێ!

خوداوەند، سرووشی بۆ مووسا کرد (دروودی خودای لێ بێت): ئەی مووســا، لەنێو ئێوەدا، کەســێك هەیە، (٤٠) ساڵە لێم یاخییەو ملکەچی فەرمانم نابێ، بەهۆی ئەو کەســەوە، بارانتان لێ گیراوەتەوە، بانگەواز بکە؛ با ئەو بەندەیە بچێتە دەرەوە لە ڕیزەکە؛ تا بارانتان بۆ ببارێنم!

مووساش بانگەوازی کرد، بەڵام کەس نەهاتە دەرێو بارانیش باری!

مووســا پێی ســەیربوو، کەس نەهاتــە دەرێو بارانیــش باری، ئەم سەرسوڕمانەی بە خودا گوت!

خودا فەرمووی: مووسا، ئەو بەندە یاخییە تۆبەی کرد!

مووسا فەرمووی: خودایە، ناوەکەیم پێ بدەو پێم بناسێنە!

خودای گەورەش فەرمووی:

ئەی مووســا، من کاتێك ســەترم کرد، ئەو تاوانی دەکرد، ئێســتا کە تۆبەی کردووەو گەڕاوەتەوە، ئابڕووی بەرم؟

ئەو کاتەی هەموو دەرگاکان دادەخرێن، چراکان هەموو دەکوژێنەوە، وەلێ دەرگای میهری خودایی، هەرگیز داناخرێ، چرای هیوای خودایی، هەرگیز خامۆش نابێ!

لە دژوارترین ساتەوەختەژانی ژیانا، ئەو کاتەی دڵ، لە کونی دەرزی تەنگتـــرە، کاتێ ئاوڕ بۆ لای خودا دەدەیتـــەوە، دەبینی نوورو خەڵاتی لێخۆشبوونی خودایی، چاوەڕوانتە!

خوداوەنـــد هێندە میهرەبانە، ئەو کاتە لێـــت زویر نییە، کە تاوان دەکـــەی، بەڵکو ئـــەو کاتە بە تەواوی زویربوون، لێت زیز دەبێ، کە لە بەزەیی ئەو خودایە، بێهیوا دەبیت!

لـــە ئەســـەردا هاتووە، کە خوداوەند دەفەرمـــوێ: " لە کەس تووڕە نەبـــووم، هێنـــدەی ئەو کەســـەی تاوان دەکات، پاشـــان لـــە بەرامبەر بەخشندەیی مندا، تاوانەکەی لا گەورەیە"

ئەمەش نابێت وامان لێ بکات، کە زێتر ئالوودەی گوناه بین، بەڵکو دەبێ، بەرامبەر ئەم فەیزە ئیلاهیو کەرەمە بێشومارو میهرە بێسنوورە، شەرم بمانگرێو سەر لە سوجدەی تۆبەکردنو پەشیمانی بڵند نەکەین!

ئیبنولقەیم دەڵێت: هەرگیز کەس لە خودا، میهرەبانترو نەرمونیانتر بەدی ناکەی، سوێند بە خودا، ئەگەر ساجید دەیزانی، چۆن بەخشینو لێبوردنو ڕەحمی خودا دای دەپۆشـــێ، بەهۆی سوجدەبردنی، هەرگیز سەری بڵند نەدەکرد.

بۆئـــەوەی ئێمە دڵخۆشـــبین بـــە بەڵێنی خودایـــی، هەرگیز بێهیوا نەبین، خودا بە گەورەترین شێواز، وەسفی بەزەیی خۆی دەکا.

بە﴿ وَإِنِّي لَغَفَّارٌ ﴾ و ﴿ تَوَّابٌ ﴾و ﴿ وَدُودٌ ﴾و ﴿ غَافِرِ ٱلذَّنۢبِ وَقَابِلِ ٱلتَّوۡبِ ﴾ وەســـفی خۆی دەکا!

لە کاتێکدا خودا، هیچ باکی لە بەندەکانی نییە، بەڵام ئاوا دەرگای سۆزو بەزەیی خۆی، خستووەتە سەر پشت!

ئیبنولقەیــم دەڵێت: «جێی سەرســوڕمان نییە، غوڵامێك ملکەچی پاشــاکەی بێتو لــە خزمەتکردنی مانــدوو نەبێت، لــە کاتێکدا زۆر ئاتاجــی بە ئەوەو هەژاری بەردەرگاکەیەتــی! بەڵکو عەجەب ئەوەیە، خودایەك بەو هەموو گەورەییو دەســەڵاتەوە، لە بەندەو غوڵامەکانی نزیك ببێتەوەو بە ئەنواعی نیعمەتو ئیحســانی، خۆی خۆشەویســت دەکا لایان، لە کاتێکا هیچ پێویستییەکی پێیان نییە!»

لە هەموو شتێ، سەیرو عەجایەبتر ئەوەیە، کە ئەم خودا گەورەیە بناسی، وەلێ خۆشت نەوێ!

گوێبیســتی بانگخوازەکە بیت، کــە پەیامبەرە، بەڵام نەچی بەرەو پیری!

بڕی قازانجــی مامەڵەکردن لەگەڵیدا بزانــی، وەلێ لەگەڵ غەیری ئەودا مامەڵە بکەی!

تووڕەیی ئەو بزانی، پاشان سەرپێچیشی بکەی!

تــاڵاوی تەنیاییو بێکەســیی کاتی یاخیبوون لــەو خودایە بچێژی، وەلێ هۆگری تاعەتی ئەو نەبی!

کاتێ گوێگرتن بۆ غەیری وتەی شیرینی ئەو، هەست بە دڵتەنگیو خەمباری بکەی، بەڵام بۆ دەرمانی دڵو سوکنایی ڕۆحت، پەنا بۆ یادو موناجاتی ئەو نەبەیت!

هەســت بە سزاو ئەشــکەنجەو ئازاری پەیوەستبوونی دڵ بکەی بە غەیری ئەوو پاشان ڕانەکەی بۆ بەهەشتی گەڕانەوە بۆ لای ئەو خودا میهرەبانە!

ئیدی با ڕانەوەســتین؛ خودا زۆر لە گومانی باشــی ئێمە، باشترە.. ناتوانین پەی بە میهرەبانی ئەو خودایە بەرین هەرگیز!

کابرایەك لە بەنی ئیســرائیل (٤٠) ســاڵ خوداپەرستی کرد، پاشان (٤٠) ساڵ تاوانو گوناهـ، دواتر بەخۆی گوت: زۆر زەحمەتە ئەگەر تۆبە بکەم، خودا لێم خۆشبێ، هەرگیز شتی وا نابێ!

لەلایەن خوداوە، بانگ کرا لە خەودا:

ئەی فلآنە کەس: خۆشت ویستین، خۆشمان ویستی!

گوێڕایەڵمان بووی، ئێمەش نزیکمان کردیتەوە!

لێمان یاخی بووی، مۆڵەتمان دای!

گەر بگەڕێیتەوە؛ قبووڵت دەکەینەوە!

کوان ئەو چاوانەی شەوانە تا بەرەبەیان، بەرۆکی بەندایەتی، بە فرمێسکی گەرم تەڕ دەکەن؟

کوان ئەو هەنسکانەی ناخ دەهەژێننو سەدای سکاڵای ڕۆح دەگەیەننە عەرشی ئیلاهی؟!

کوان ئەو لێوانەی لەگەڵ کزەی دەروونا هەڵدەقرچێنو کوان ئەو دڵانەی لە ئەسحارا، وەکو مۆم دەتوێنەوە؟!

کوان ئەو هەناسانەی بە میسکی تیلاوەی قورئانو درووددو سەڵاوات، موعەتتەر بوونو هەموو دەشتودەری مەحەببەت، بە گوڵاوی ئەوینی خودایی گوڵاوپرژێن دەکەن؟!

کوا هەڵگرانی چرای تەقواو شەیدایانی لیقای ئیلاهی؟!

کوا ئەو گۆنا زەردانەی کە داستانی ئەوینێکیان تۆمار کردووە، کە تەنها ﴿يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ﴾ المائدة: ٥٤ دەتوانێ گوزارشی لێوە بکات!

ئازیزم، کابرایەك چووە ماڵی ئەبوزەڕی غیفاری، چاوی بەنێو ماڵەکەیدا گێڕا، چی وەهای چاو پێ نەکەوت! پرسی: ماڵەکەت بۆ وا چۆڵە، کوا شتومەكو کەرەسەی ماڵ؟!

ئەبوزەڕ لە وەڵامدا گوتی: ئێرە، ماڵی ئێمە نییە، خاوەنماڵ نایەڵێت زۆر تێیدا نیشتەجێ ببین، ئەگەر هێشتبای، پڕم دەکرد لە شتومەك، هەر بۆیە، باشترین کەرەسەمان بۆ ماڵێك دەنێرین، کە هاکا بۆی چووین!

خۆزگە ئێمەش، ماڵی ڕاستەقینەی خۆمان دەزانیو ئایەتی ﴿إِنَّمَا هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا مَتَٰعٌ وَإِنَّ ٱلْءَاخِرَةَ هِىَ دَارُ ٱلْقَرَارِ﴾ غافر: ٣٩ مان دەکردە ملوانکەی ملمان!

ئەوەی ئەم ڕاستییەی درکاند، مونمینی ئالی فیرعەون بوو! لەنێو نازونیعمەتو کۆشكو تەلاری فیرعەوندا دەژیا! وەلێ، ئاوڕی نەدایەوە بۆ دونیا، باقوبریقی فانیی دونیا فریوی نەدا، دەیزانی ئێرە، ماڵی کاتییە!

جێگای حەوانەوەو پشوو نییە، هاکا کاروانچیی مەرگ، بانگی کردیو دەستت لە هەموو خۆشیو مەتاعی ئەم دنیایە هەڵگرت!!

وەلێ ئەفسووس، هەزار ئەفسووس، ئەمڕۆ ئێمە، هێندە مەفتوونی ئەم دونیا فانییە بووین، ڕۆحمان پێش لاشەمان مردووەو بۆتە هێلانەی بایەقووش!!

خۆ ئێمە دەزانین، خۆشییەکانی دونیا فانین، لەزەتەکانی کاتین، هەمیشە زەمی دونیاو ئەهلی دونیا دەکەین، ئەی بۆچی ئێمەش، لەوان خراپتر، بەشوێنیدا ڕادەکەین؟! چەندجار چووینەتە خزمەتی ئایەتی ﴿ قُلْ مَتَٰعُ ٱلدُّنْيَا قَلِيلٌ وَٱلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ لِّمَنِ ٱتَّقَىٰ ﴾ النساء: ٧٧

خوداوەند بە پێغەمبەر دەفەرموێت: کە پێمان ڕابگەیەنێ: خۆشیو لەزەتی ئەم دونیایە، زۆر کەموکورتە، خۆشیو لەزەتی دوایی، زۆر باشترە بۆ لە خوداترسان!!

ئەی هاوار ئازیزم، دڵی ئێمە، چی بەسەر هاتووە، پەیامی خودایە، پەیامبەر محەممەدە، هەواڵەکە یەقینە! بەڵام لەگەڵ دڵی مردوواندا، چی دەڵێیت؟!

هەر کاتێك خۆشەویستیی دونیا، ڕەگی گڵاوی لە دڵدا داکوتا، ئیتر ئیمان، بەیداخی خۆی، لەنێو ئەو دڵەدا هەڵناکاتو ئەوینی خودایی، ئەو

شوێنە جێدێڵێ!

ئیبنولجەوزی دەڵێت: «دونیا میری ئەو کەسەیە داوای دەکات، نۆکەری ئەو کەسەیە، فەرامۆشی دەکات! دونیا داواکارو داواکراوە، ئەوەی داوای بکات، ڕەفزی دەکات. ئەوەشی ڕەفزی بکات، داوای دەکات! دونیا پردێکە بۆ ئاخیرەت، بەسەریدا گوزەر بکەن، نەك ئاوەدانی بکەنەوە بۆ هەتاهەتایی، ژیری نییە، درووستکردنی کۆشكو تەلار لەسەر پردو ڕێگا»!

ئێمە دەزانین، بۆ ئەوە درووست نەبووین، کە هەر لێرە بین، هاگا بارگەو بنەمان پێچایەوەو کەشکۆڵی سەفەرمان کردەشان، بەڵام کوا ناڵەی سەحەری پێشەوا عەلی «ڕەزای خودای لێ بێت» کە شەوان دەیگوت: ئای لە کەشکۆڵی خاڵیو ڕێگای دوورو تەنیایی ڕێگا!

ئەم دونیایە، هەرچەندە خۆشیو لەزەتی تێدا بن، هەموو نازونیعمەتەکانی ناگاتە دەنکە زیخێکی کانییەکی فیردەوس!

هەموو پەڕۆوپاتاڵی دونیا، ناگەنە داوێك لە ئاوریشمی بەهەشت!

هەموو خواردنو خواردنەوەی دونیا، ناگەنە دڵۆپێك لە گوڵاوی سەرمۆر!

هەموو جوانانی دونیا، ناگەن بە نیگایەی حۆرییەکی بەڵەکچاوی جەننەت!!

لەگەڵ یەکەم تەکانی دەرچوونی ڕۆحیشدا، هەموو خۆشیو لەزەتی دونیات لەبیر دەچێ!

پاشاکان لە سەرەمەرگا، بە ئاواتی ئەوەبوون، جلشۆری ماڵان بوونایە!

ئەی هاوار چەندە زەحمەتە، بە دەستی بەتاڵ بڕۆیی‌و دنیایەك جێ بێڵی، کە لە پێناویدا، هەرچی خودا پێی ناخۆش بێ، کردووتە!

ناتوانیت لەگەڵ خۆتا، درەمێك بەری! ئەو ڕۆژە داماوترین کەس، ئەهلی پارەوموڵك‌و دەسەڵاتە؛ چونکە ئەوانە، دەسکەلای دەستی دونیا بوون‌و پاش یاری پێکردنێکی زۆر، ئەوڕۆ دنیا، داماوو ڕەنجبەخەساریان دەکات.

عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان،

لە سەرەمەرگا دەگریاو دەیگوت: خۆزگە جلشۆری ماڵان بام‌و بە ڕەنجی شانی خۆم، قووتی ڕۆژانەم پەیدا دەکردو کاروباری کەسم لە ئەستۆ نەبا!

سەلەمەی کوڕی عەبدولڕەحمانیش دەڵێ: سوپاس بۆ خودا، ئەوان لە کاتی مردنا، خۆزگە بە ژیانی ئێمە دەخوازن، بەڵام ئێمە لەسەرەمەرگا، خۆزگە بە ژیانی ئەوان ناخوازین!

هاروونە ڕەشید دەگریاو دەیگوت: "یا من لَا یَزُولُ مُلکُهُ ارْحَمْ مَنْ زَالَ مُلکُهُ» ئەی ئەو کەسەی هەرگیز موڵکی نافەوتێ‌و هەر دەمێنێ، بەزەییت بە کەسێکدا بێتەوە، کە موڵك‌و دەسەڵاتی فەوتاو نەما!

نازانم دڵێك بە خودای گەورە ئاشنا بووبێ‌و بەتاسەی مەزید بێ، ئیدی چی داوە لە پارەو موڵکی دونیا!

کە سێك ﴿غَنِيٌّ عَنِ ٱلۡعَـٰلَمِينَ﴾ی ناسیبێ، ئیدی چاوەڕێی دەستی کێ دەکا؟!

ئازیزم، دڵەکەت پاك بکەرەوە لە ژەنگی دونیاویستی، تا لەبری

زبڵدانی دونیا، پەروانەی دوری عەرشی کردگار بێ!

تا ئەو کاتەی دەوڵەمەندەکان ئابڕوویان دەچێو پاشــاو سەرۆکەکان ڕیســوا دەبن، تۆ بە کەشــکۆڵی پڕ لە کرداری چاکــەوە، بەرەو دیداری پەروەردگار، ڕۆحە پاکەکەت بدات لە شەقەی باڵ..

مامۆستای ئازیزم، کاتێك بۆ دەوروبەری خۆم دەڕوانم، بە هەر چوارلامدا، دەیان مرۆڤی سەرگەردانو داماو دەبینم، کە نوقمی دەریای غەفڵەتنو بێئاگا لە ژینو دین، ڕۆژەکانی تەمەن بەڕێ دەکەن!

دەیانبینم، تۆزی خەمێکی زەرد، ڕوخساری داپۆشیون، لە سیمایاندا دەیان پرسیارو سەدان ئەندێشەو خەیاڵ دەخوێنرێتەوە، سەریان لێ شێواوە، نازانن چی دەکەن!

ناشزانن دەبێ چی بکەن؟!

بەشوێن سەرابدا ڕادەکەنو بە شەرابی دەزانن!

شوێن دێوەزمە کەوتوونو بە شاجوانی دەزانن!

لە دەڤەری نوور ڕادەکەنو خۆ دەهاونە نێو کەندەڵانی ئاگر!

لە باوەشی فیردەوس هەڵدێنو دەچنە نێو باوەشی ئەژدیها!

ئای مامۆستا، ئەمانە چەندە داماوو هەژارن!

ئازیزم، زۆرن ئەوانەی وێڵی سەعادەتو بەختەوەرینو ڕێگاکەی نادۆزنەوە!

زۆرن ئەوانەی مەحروومن لە نووری ئیلاهیو لە شەوەزەنگی نەفامیدا، پەلەقاژەیانە!

زۆرن ئەوانەی لە شیلەی شەهدی ئیمان بێبەشن..

زۆرن ئەوانەی کە خۆیان لێ ونەو لە مرۆڤبوونی خۆشیان مەحروومن!

زۆرن ئەوانەی کە بوونەتە نێچیری ئەهریمەنو دەسکەلای



شەیتانۆچکەکان!

زۆرن ئەوانەی هێشـــتا تیشــکی باوەڕ نەیتوانیــوە، لە کلاوڕۆژنەی دڵیانەوە بچێتە ژووری!

زۆرن ئەوانەی کە هێشتا دەستێکی نەرم، نەیتوانیوە فرمێسکەکانیان بۆ بسڕێ‌و باوەشێکی گەرم نەیتوانیوە لە ئامێزیان بگرێ!

ئای ئەگەر دەســـتیان دەگاتە «عروة الوثقى»و دەچنە نێو گوڵزاری ئیمان‌و ئاشنا دەبن بە ئاوازی ﴿قُلۡ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسۡرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ لَا تَقۡنَطُواْ مِن رَّحۡمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا﴾ الزمر: ٥٣

ئـــای بۆ موصعەبێ، ڕۆحیان میســـکڕێژو ســـۆمایان بە کلی نبوەت، سورمەڕێژ بکات!

ئای بـــۆ هەڵگرانـــی ﴿وَمَنۡ أَحۡسَنُ قَوۡلٗا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ﴾ فصلت: ٣٣

ئای بۆ موعازێك بەنەرمی‌و دانایی یەمانی خۆیەوە!

گەر ئێمە نەچین بە پیریانەوە، کێ بچێ؟!

گەر ئێمە نەیانگەینێ، بۆ کوێ دەچن؟!

گـــەر ئێمە نەبین، ئیدی کێ خەمی ئەمـــان‌و هەزارانی وەك ئەمان بخوات؟!

کێ دەستیان بگرێت، بەرەو کەناری دڵنیایی!

کێ تەپوتۆزی خەم‌و پەژارەو نەهامەتییان بڕەوێنێتەوە؟!

ئازیزم، ئێمە تاکەی دەبێ هەر تەماشا کەین!

ئەوان وا دەخنکێن بۆ دڵۆپێ میهری خودایی.

ئەوان وا دەسووتێن بۆ چرپەیەك لە هەنگوینی حەقیقەت!

ئەوان بۆ ترووسکەیەك وێڵن؛ تا بەرپێی خۆیان بدۆزنەوە!

ئای ئێمە چەند گوناهبارین!

ئۆباڵی ئەوان، وا بە ئەستۆی ئێمە!

کەی بچینو دەستێك بدەینە دەستی شکستیان..

کەی بچینو بڕستێك بدەینە جەستەی شەکەتیان.

ئێمە نمەی بارانین، پرووشـــەی ئاونگین، نەرمیی شەونمین، شنەی سروەی شادین.

ئێمــە نەبین، کێ پەیامی دواییــن پەیامبەر بگەیەنێ، کێ موژدەی فیردەوسو نیدای..

﴿ يَٰعِبَادِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡكُمُ ٱلۡيَوۡمَ وَلَآ أَنتُمۡ تَحۡزَنُونَ ﴾ الزخرف: ٦٨ ڕاگەیەنێ؟!

دەی ئازیزان دەی، کات زۆر درەنگە، ناتانەوێ لە بەهەشــتا، لەگەڵ موصعەبو موعازدا کۆ ببنەوە؟!

ناتانەوێ پێشەوای سەروەرمان، شانازیتان پێوە بکات؟!

خێــرا کەن، بەدەســتی بەدەســتنوێژو ســیمای نوورینتانەوە فریا کەون.. درِ بەم شەوەزەنگی نەفامییە بدەن!

مامۆستای ئازیزم، وشە بە وشەی نامە پرشنگدارەکەتم، لە گوێدا دەزرنگێتەوە.....

ئێستا هەست دەکەم کە چی لێپرسراوێتییەکی گەورەم لەسەر شانە!

ئێستا هەست دەکەم، موسڵمانی خاوەنپەیام و پەروەردەی ڕاستەقینە، کەشتی نووحەو دەبێت هەوڵ بدات، زۆرترین ژمارەی مرۆڤەکان، لە خنکانو نوقمبوون ڕزگار بکات!

دەستیان بگرێت؛ لە تووڵەڕێوە، بۆ شاڕێی ئیسلام!

لەنێو دەیجووری ڕەشەوە، بۆ نێو دەریای نوورو چلچرای ئیمان!

ڕۆژانە دەبینم، دەستە دەستە خوشکو براکانم، وەك پەپوولە، خۆ دەهاونە نێو گڕی ئاگرو هەڵدەقرچێن!

پەیتا پەیتا، لە ئایینی بەرزو لە پەیامی نوورینی خۆیان دوور دەکەونـەوەو لە شیرینیو لەزەتی ئیمانو نزیکی لە خـوداو سۆزو میهرەبانیی خودایی، خۆ مەحرووم دەکەن!

نازانن ئیدی لەو نوورە ئیلاهییە زیاتر، نوورێکی دی نییە!﴿ وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ ٱللَّهُ لَهُۥ نُورًا فَمَا لَهُۥ مِن نُّورٍ ﴾النور:٤٠

نازانن چەندە جیاوازە: ڕێگای ڕاستو ڕێگای نادیار!

﴿ أَفَمَن يَمْشِى مُكِبًّا عَلَىٰ وَجْهِهِۦٓ أَهْدَىٰٓ أَمَّن يَمْشِى سَوِيًّا عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾ الملك: ٢٢

نازانن ڕێزو گەورەییو شکۆمەندی، تەنها خودا دەیبەخشیو ئەوەی



خوداوەند ڕێزی پێ نەبەخشێ، ئیدی هەرگیز پلەوپایەیەك بەدی ناكات..... ﴿ وَمَن يُهِنِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّكْرِمٍ ﴾ الحج:١٨

ئازیزم، خۆشحاڵم كە ئێستا پێگەی خۆت زانیو لە ڕۆڵی گرنگو بێوێنەت ئاگادار بووی!

تۆ هەڵگری چرای نبوەتو سەدای ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَـٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَـٰلَمِينَ ﴾ی.. تۆ زایەڵەی ئاوازی «أمتي، أمتي» دواهەناسەكانی ژیانی سەروەری!

تۆ چرپەی ڕۆحی «اللّهُمّ اغْفِرْ لِقَوْمِي فَإِنّهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ»ی!

تۆ شەونمی گوڵاوی گوڵشەنی «إِنَّمَا بُعِثْتُمْ مُيَسِّرِينَ»ی!

تۆ كەیلی بۆنی میسكی نێو دەستی ئاوریشمینی موحوممەدو پەروەردەی شەكرە وشەی لێوی بەخەندەی ئەحمەدی!

تۆ پەروەدەی «يسّروا ولا تعسّروا»ی!

چاولەقاپیی ئەو پەروەردگارە مەزنەی كە دەفەرموێ:

﴿ مَّا يَفْعَـلُ ٱللَّهُ بِعَذَابِكُمْ إِن شَكَرْتُمْ وَءَامَنـتُمْ ﴾ النساء:١٤٧

تۆ هیوای، لە زەمەنی بێهواییدا، باوەشی سۆزی، لە زەمەنی بێمیهریدا، خۆشەویستیت، لە زەمەنی ڕقو كینەدا!

پارووی نانی، لە زەمەنی هەژاریدا! دەستی میهری لە زەمەنی زوڵمو ستەمدا! پاكیو عەفافی، لە سەردەمی تاوانو گوناها!

سیمای فریشتەی لە سەردەمی ئەهریمەندا!

ئارامیو هێلانەی پشووی، لە زەمەنی دڵەڕاوكێو نیگەرانیو ترسدا...

دەبا ئازیزم، ئێمە هەتوانی برینو کازیوەی بەیانو سرووی بەهارو خۆری هیواو باوەشی ئەوینی خودایی بین!

مرۆڤەکانی دەوروبەرمان ماندوون، شەکەتن، گرفتارن، ڕاستیو حەقیقەتیان لێ ون بووە!

گومانو ئارەزوو، باقوبریقی دونیا، دەستی ناوەتە بینەقاقایان! بۆ گەیشتن بە بەختیاریو کامەرانی، ڕێگای زۆریان تاقی کردەوە، بەڵام هەمووی سەراب بوو!

ماددەپەرستیو ڕاکردن بە شوێن ئارەزووەکاندا، ڕۆحی کوشتن!

با جارێکی دی، بە خودای گەورەیان ئاشنا بکەین، لەسەر خوانی پیتە زێڕینەکانی قورئان کۆببینەوە!

با بە ئاوی دەستنوێژ، تەپوتۆزی خەمو پەژارەو نەهامەتییان بسڕینو دڵەکانیان بکەینە یەك ڕووگەو دەستەکانیان بەرەو ئاسمان بڵند بکەین؛ تا لەوێدا، جارێکی دی خۆیان بدۆزنەوە، جارێکی دی تامی ژیان بکەنو هەست بکەن کە هەموو خۆشیو لەزەتەکانی دونیا، ناگاتە لەزەتی یەك سوجدە بۆ پەروەردگار!

پێشیان بڵێ ئازیزم:

خودا خۆشحاڵە بە گەڕانەوەتان، خودا خۆشی دەوێن، خودا دەرگای میهری لەسەر پشتەو بەردەوام پێیان دەفەرموێ:

﴿ وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ النور:٣١

ئازیزم، شـــەپۆلێك لە دونیاویستـــیو تەمی غەفڵەتو لەیادچوونی ئاخیرەت، دڵو دەروونی مرۆڤەکانی وەها داپۆشـــیوە، کە سۆمای چاوی لێـــڵ کردوونو خەندەی لێوی لـــێ دزیونو خەمو بەزارە، دەفەری دڵی داگیر کردوون.

ئەم دونیا بچکۆلەیەو ئەم دوو ڕۆژە کورتەی تەمەن، چۆن گیرۆدەی کردوون، ئەگەر مرۆڤ ژیرو ئاوەزدار با؛ هێندەی پووشێك، خەمی لەم دنیا فانییە نەدەخوارد!

دراوودرەم، زیووزەڕ، چییان وەسەر ئەم خەڵکەدا هێناوە!!

خۆ ئێمە لێرە، بۆ بەهەشتی ئەبەدی ناگەڕێین!!

بەتەمانین تاسەر، لێرە دابنیشین..

ئەوە بێباوەڕانن کە دەیانەوێت، هەموو بەناوخۆشییەکان، لەم یەك دوو ڕۆژەی دونیادا تاقی بکەنەوە!

ئەبوحەییانی تەوحیدی دەڵێت:

«اَلدُّنْيَا جَنَّةُ الْكَافِرِ لأَنَّهُ لَا يَلْحَظُ مَعَادًا، وَلَا يَشْتَاقُ ثَوابًا».

دونیا بەهەشتی بێباوەڕە؛ چونکە ئەو، نە چاوەڕێی زیندووبوونەوە دەکات، نە بەتاسەی پاداشتی خودایە.

ئێرەش بەشـــی ئەو هەموو خۆزگەو حەزو ئارەزووانە ناکات؛ بۆیە ئـــاوا بە هەر چوارلادا پەل دەکوتـــێو جگەلە تێرکردنی ئارەزوو، هیچ شتێکی دی لەبەرچاو ناگرێ!

هاوکات وە نەبێ، باوەڕدار لە بەهەشـــتی دونیا بێبەش بێتو دونیا



جگــە لــە زیندان بۆ ئەو، هیچــی دی نەبێت! بەڵكو ناخــی باوەڕدار، بەهەشــتێکی هێندە ئاوەدانە، کە لە دەروازەی ئەو بەهەشتەوە، نیگای بڕیوەتە جەننەتولمەئوای ئەبەدی!

دونیــا زیندانە بۆ باوەڕدار؛ چونکە ڕۆح دەیەوێت لە قەفەزی ئەم دونیایە، ڕزگاری بێتو بگاتە لیقای ئیلاهیو مەئوای هەمیشەیی!

عومەیرئاسا خواردنی چەند دەنکە خورمایەك، بە تەمەنێکی درێژ دەزانــێ بــۆ دواکەوتن لە بەهەشــتێك کە فراوانترە لە ئاســمانەکانو زەوی!

ئەو دەزانێ، کە خۆخلافاندن بە کارو کایەی ئەم دونیا، لە خۆشترین دیدار دوای دەخات!

وەلێ مەخابن! ئێمە هێندە خەریکی ئەم خانۆچکە منداڵانەی دونیاو ماڵەباجێنەی ئێرەین! هەر ناڵێی بەتەمای بەهەشتین!

باشــە بۆچی لە خۆمان ناپرســین، ئەوەی ئێستا پێوەی خەریکین، دەمانگەیەنێت بە بەهەشت!

کاتێك ئێمە، ئاوا بەتوندی، باوەشمان کردۆتەوە بۆ دونیاو هەرگیز حــەز ناکەیــن، بەجێی بهێڵین، بەهەشــت باوەشــمان بــۆ دەکاتەوەو فریشتەکان لە پێشــوازیدا دەڵێن: ﴿ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡ طِبۡتُمۡ فَٱدۡخُلُوهَا خَٰلِدِينَ ﴾ الزمر: ٧٣

دوو خۆشەویست لە یەك دڵدا، جێیان نابێتەوە؟!

ناترسی لەو کەسانە نەبیت، کە پێغەمبەر «ﷺ» دەفەرموێت: «تَعِسَ

عَبْدُ الدِّينار وَعَبْدُ الدِّرْهَم»؟! البخاري

چونکـــە دڵنیابە، خاوەنی دینارو درەم، کلۆڵو داماوو ســـەرگەردانو قوڕبەسەرە، با هەموو دونیاشی هەبێت!

چونکـــە ئەمە نزای پەیامبـــەرە، دەبێت هەر خەمو پەژارەو دەردی سەری بەشی بێت!!

ئـــەوان وا دەزانن، پارە بەختەوەری درووســـت دەکات؛ چونکە کاتێك پارەمـــان هەبوو؛ دەتوانین ئەوە بکەین، ئـــەوە بکڕین، ئەوە بخۆین، ئەوە لەبەر بکەین، ئەوە تاقی بکەینەوە، ئەوە بین کە دەمانەوێت!

بەڵام هەرگیز بەم شێوەیە، بەختەوەری بەدەست نایەت!

بەختەوەریـــی دونیـــا، ئەگەر بـــە بەختەوەریـــی ئاخیرەتەوە گرێ نەدرابێت، هیچ سوودێکی نییە! دەکرێت بۆ چەند ساتێك شادمان بیت، بەڵام بۆ هەمیشـــە، هەرگیز بە ســـەروەتو سامانی دونیا، بەختەوەری بەدەست ناهێنی!

هەر لەنێو ئەو دونیایەی کە زیندانی باوەڕدارە، بەراورد بە گەیشتن بە فیردەوس، بەهەشـــتێك هەس، کە نە ماڵو نە سامانو نە کورسیو دەسەڵاتو پلەوپایەو نە کۆشكو تەلاری بەرزو بڵند، ناتوانن درووستی بکەن!!

ئەوە فیردەوسی ڕۆح و نۆخژنی دڵو ئارامیی دەروونە!

لەوێدا بەختەوەری، ڕەشـــماڵی خۆی هەڵدەداتو باوەڕداری دڵارام، بە چاوی بەسیرەت، ڕووەو نەعیمی موقیم دەڕوانێ!

ئەوە ئەو بەهەشتەیە، کە هەر کەس تامی نەکردبێ؛ تامی فیردەوس ناکات!

چۆن بگەینە ئەو بەهەشتە شیرینە؟ چۆن خەمو خەیاڵی دونیا، دڵو دەروونمان داگیر نەکاتو کوڕی ئاخیرەت بین، نەك کوڕی دونیا؟!

وەڵامی ئەم پرسیارانە، هەڵدەگرین بۆ نامەی داهاتوو.. کۆتاییش بەم وتەیەی خولەیدی عەسری دەهێنم، کە دەڵێت:

براکانم، کەس هەیە، بەتاسەی دیداری خۆشەویستەکەی نەبێت؟! کەواتە: دەی خوداتان خۆش بوێو هێدی هێدی بۆ دیداری ئەو هەنگاو بنێن!




# نامەی پەنجاویەک

ڕێژنەی بارانەکە ڕانەدەوەستا، کەون هەموو ئاوی لێ دەچۆڕا، ئاسۆ بەرگی کریستاڵی لەبەر کردبوو، وشکێك نەمابوو، تەڕ نەبووبێ، هێلانەیەك نەمابوو، پرووشەی بارانی نەگەشتبێتێ!

ڕێژنەی بەردەوامی بارانەکە، ڕەوەچۆلەکەکانی زووتر ڕووەو هێلانە چکۆلەکانی خۆیان ڕەوانە دەکردەوە، دڵنیام ئەمشەو، ئاو دزە دەکاتە

ناو دەواری کۆچەرانو زۆر لانەی گەرم سارد دەکاتەوە!

لەم شەوە ساردەدا، تەنها دڵە گەرمەکان بەرگە دەگرن!

ئەوانەی هەمیشە باوەشی گەرمیان هەس، چ لەنێو سەرماو وەیشوومەی زستانێدا بن، یان لەنێو گوڵستانی بەهاریێ!

ئەوان، گڕی ئەوینێك لە ناخیاندا داگیرساوە، کە وەکو نالی وەسفی دەکات:

لە دڵدا ئاتەشی عیشقت، بڵێسەی میسلی تەندوورە
شەتی ئەشکم نەبێ مانیع، دەسووتێم دەبمە کۆی نوورە

خۆزگەم بەو دڵانە ئازیزم، دڵی ئێمە بە هەزاران لافاوو شەستەبارانی بەهاری ناخوسێ، وەلێ دڵی ئەوان، بە گڕی ئەوینی خودایی بۆتە ئاوریشم!

سەدای نمەی ئەسرینو گزەی دڵی بەفرینو زایەڵەی ئاوازی﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ ٱللَّهِ ﴾و چریکەی ﴿أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴾ تەختو تاراجی دڵ، دێنێتە لەرزین!

چ پەنایەکی مەزنی پەروەردگار!! چ هێزێکی گەورەی کردگار! خاوەنی چ عەتایەکی بێسنووری ئیلاهی!

چ بەندەیەکی گوناهبارو کەساسم، هێندەی چۆلەکەیەکی تەڕی بێزمانی بەر ئەو بارانە، نەمتوانیوە سوپاست بکەم!

هەموو باڵندەکانی دونیا، هێندەی من دنیایان نەداوە بە کۆڵیاندا!!

چی دەبوو، منیش وەکوو ئەوان، ئێواران بە دوو سێ دەنکە گەنم

ڕازیبام‌و لە هێلانەیەکی چکۆلەدا، ڕووەو ئاسمان چاوەکانم لێکنان؟!

یەقینم هەبا، کە ئەگەر بژیم، خواردنی سبەییم لەسەر ویەو ئەگەریش بمرم، نوێژی سبەینێم لەسەر نییە!

وەلێ هێندەی چاوم لە ڕزقی سبەیە، هێندە نوێژی ئەمرۆم ئەدا نەکردووە!!

پرسیار لە مەعرووفی کەرخی کرا: خوداویستان، چۆن ئاوا توانان لەسەر عیبادەت؟

لە وەڵامـدا گوتی: بە دەرچوونی دونیا لەنێو دڵیان، خۆ ئەگەر دونیایان لەنێو دڵ با، نەیاندەتوانی یەك سوجدەی ڕاستەقینە ببەن بۆ خودا!!

کاتێك دڵ، دەبێتە دیوانی ئەوینی خودایی، ئیدی ڕێگا بە خۆشەویستی دونیای فانی نادات!!

لەنێو کووچەو کۆڵانی دونیای فانیدا، ون نابێت!

ڕێگە نادات، ساتێك تەمەنی، دوور لە یادی مەحبووبی دڵی، بگوزەرێ!

ئەو ساتەی سایەو سێوەری میهری خودایی دەدۆزێـتـەوە؛ ئیدی خەیاڵی ئاسوودەو دڵی ئارامە!

چونکە دەزانێ، بێ دڵنیابوون بە خەڵاتی ئەو کردگارە؛ ژیان جگە لە حەسرەت‌و پەشیمانی، چی دی نییە!

حەسەنی بەسرِی دەڵێت: هەموو بنیادەمێك، بەسێ حەسرەتەوە، ماڵاوایی لە دونیا دەکات!

حەسرەتی ئەوەی کە نەیتوانی لەزەت لە هەموو ئەو شتانە وەربگرێ، کە هەموو تەمەنی، لە کۆکردنەوەیدا سەرف کرد!

حەسرەتی ئەوەی کە نەگەیشتە هەموو هیواو ئاواتەکانی، حەسرەتی ئەوەی کە نەیتوانی، تویشووی قیامەتی ئامادە بکات!

نالیش دەڵێت:

عومرت نەفەسێکی، کە هەموو عالەمی دێنا
بمرە لە غەمیدا، کە هەموو سەرفی غەمت بوو!

بەندەی ڕاستەقینەی خودا، دەزانێ ﴿قُلْ مَتَٰعُ ٱلدُّنْيَا قَلِيلٌ وَٱلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ لِّمَنِ ٱتَّقَىٰ﴾ مانای چییە!

ئەو دەزانێ، مایەپووچترین کەس، جامیعی دونیایە!

داماوترین کەس ئەوەیە، کە دونیای فانی داوە بە کۆڵیدا!

چۆن ڕێگا دەدات، دونیا لە عوقبا دووری بخاتەوەو لە زیکرو فیکری تەنها مەحبووبی دڵو ڕووگەی نازونیازی، غافڵی بکات!

هەرگیز ڕێگا بە کاری وەها نادات!!

ڕەحمەتی خودا لە نالی، چەند جوان وەسفی ئەهلی دونیا دەکات:

هەرچەندە کە عومری خزرو جامی جەمت بوو
چونکە ئەمەلت زۆرە، چ عومرێکی کەمت بوو
ئەی جامیعی دونیاو قیامەت بە خەیاڵات
ئەو ڕۆژە کە مردی، نە ئەوت بوو، نە ئەمت بوو

# مامۆستای ئازیزم..

هاودەمیی زۆر کەسم کرد، کتێبگەلێکی زۆرم خوێندەوە، چیرۆکم ڕۆمانو بەسەرهاتی زۆرم موتالا کرد، وەلێ تا نەبوومە هۆگرو هاودەمی قورئان، ئارامی نەبووە میوانی دلمو هەوری ڕەشی خەمم نەڕەوییەوەو نۆخژنی دلم نەهات، تەنها لەژێر سایەی قورئاندا، تامی ژیانم کرد!

ئەو کاتەی پیتەکانی قورئان، دلۆپ دلۆپ وەکو هەنگوین دەتکانە نێو ڕۆحم، ئەو کاتەی ئاوێتەی وشــە پیرۆزەکانی پەروەردگار دەبووم، ئــەو کاتــەی پیرۆزترین پەیامم بە زوبانم دەخوێنــدەوە، ئەو کاتەی هەیبەتو جەلالو جەمالی سرووشــی ئیلاهــی، وەك زەمینلەرزە، دلو دەروونی دەهەژاندم، هەســتم بە تامو چێژی شــادمانییەك دەکرد، کە هەرگیز لە هیچ شوێنێکی دی، وەدەستم ناکەون!

ئەو کات زانیم، هەموو چرکەیەکی ژیان بەبێ قورئان، تەنها داخو حەسرەتە!!

ئازیزم، ژیان لەگەڵ قورئان، واتە: هەستکردن بە ژیانو هەڵدانەوەی پەردە لەسەر هەموو حەقایقو ڕاستییەکانی ژیان!

واتە: زیندووبوونەوەی دڵو زیندەگیی ڕۆح!

خوێندنــەوەی قورئانو ڕامان لە مانای بەرزی، واتە: دەســتگرتن بە چرای ڕووناکــی هیدایەتو گرتنی ڕێگای ڕاســتو بەردەوامبوونو سوکنایی دڵو دڵنیایی هەمیشەیی.



﴿ كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَ وَرَتَّلْنَٰهُ تَرْتِيلًا ﴾ الفرقان: ٣٢

هەر بۆیە پێغەمبەری نازدارمان، تەنها بەوە ڕانەدەوەستا، کە شەوانە لە خزمەتی ئایەتە پیرۆزەکاندا، بە ئەسرینی چاوی، گەورەترین، داستانی خۆشەویستی تۆمار بکاتو تا بەری بەیانی، بە دەم هەنسکەوە، قورئانی پیرۆز بخوێنێ!

بەڵکوو دەچووە لای عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودو پێی دەفەرموو: اقْرَأْ عَلَيَّ الْقُرْآنَ قورئانم بۆ بخوێنە! عەبدوڵڵا دەیگوت: أَقْرَأُ عَلَيْكَ وَعَلَيْكَ أُنْزِلَ؟ ئایا من بۆ تۆی بخوێنم، لەکاتێکدا ئەم قورئانە، بۆ تۆ هاتووە؟! دەیفەرموو: إِنِّي أُحِبُّ أَنْ أَسْمَعَهُ مِنْ غَيْرِي من پێم خۆشە، لە کەسانی دییەوە، گوێبیستی بم!

چونکە ئەو، شەیدای دەنگی ئیبنو مەسعوود بوو، دەیفەرموو: هەر کەسێك دەیەوێت، قورئانی بە تەڕو پاراوی گوێ لێ بێ، وەکوو خۆی کە دابەزیوە، با گوێ لە خوێندنەوەی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود بگرێ!

عەبدوڵڵا دەفەرموێ: سوورەتی «النساء»م بۆ خوێند، تا گەیشتمە ﴿ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍۭ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا ﴾ النساء: ٤١ فەرمووی: تا ئێرە، بەسە!

کاتێك سەرم هەڵبڕی، بینیم فرمێسك زەنگۆڵ زەنگۆڵ، بەسەر ڕوومەتیدا دێتە خواری!

هیچ ژیانێك، ناگاتە چرکەیەك ژیان لەگەڵ قورئان، هیچ لە زەتو

خۆشییەك، ناگاتە شیرینی تیلاوەی قورئان، وەلێ بۆ کەسێك لێی حاڵی ببێت!

﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُۥ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى ٱلسَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ ﴾ ق: ٣٧

بۆیە خالیدی کوڕی وەلید، لە کۆتایی تەمەنیدا، قورئانی گرتە باوەشو دەستی کرد بە گریانو دەیگوت:

جیهاد سەرقاڵی کردمو نەمتوانی لە خزمەتتدا بم!

ئازیزم با ئیدی بەشێکی تەمەنمان لە خزمەت خوێندنەوەو لەبەرکردن و ڕامان لە وشەو واتاکانی قورئاندا بەسەربەرین!

گەیشــتنی ئەم نامەیەم لە کاتێکدایە، کە تەنها چەند ڕۆژێك ماوە بۆ گەیشتنی میوانێکی ئازیزو لەدڵاشیرین..

دەســتەونەزەر لــە پێشــوازیدایین، ڕۆحمان زۆر مانــدووە، زێتر لە لاشەمان، بە ڕووخســارێکی کزەوە، بە دیدێکی شەرمنەوە، چاوەڕوانی هەڵاتنی هیلالی ڕەمەزانین!

لە ئینتیــزاری میوانێکداین، کە لەگەڵ خۆیدا، گەورەترین خەڵاتی هێنا! کە قورئانی پیرۆزە!

﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴾ ص: ٢٩

قورئان، ئەو پەڕاوەی کە تاکە سەرچاوەی خێروخۆشیو سەعادەتو سەربەرزیو سەرفرازیو پێشکەوتنو سەرکەوتنو سەربەستیو ئارامیو دڵنیاییو بەختەوەریمانە!

ئــەو قورئانــەی کە نــووری موبیــنو چــرای درەوشــاوەو بارانی ڕەحمــەتو مەرهەمی دڵانو دەرمانــی دەردانو چارەی گرفتانو هێزی ژیانو پاسەوانی هەموو بەرژەوەندییەکانی مرۆڤە!

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَكُم بُرۡهَٰنٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ نُورٗا مُّبِينٗا ﴾ النساء: ١٧٤

قورئان ئەو پەیامەی کە وتەی جوانی پەروەردگارە، کە هیچ پەڕاوو کتێبو نووسراوێك، ناکاتە بەرزیو بڵندیو جوانیو ڕاستیو درووستیو شیرینیو حەلاوەتی وتەو ماناکانی!

﴿ قَدۡ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٞ وَكِتَٰبٞ مُّبِينٞ يَهۡدِي بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ

رِضۡوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ وَيُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذۡنِهِۦ وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴾ المائدة: ١٥ - ١٦

هەر بۆیە نازناوی مانگی ڕەمەزان، مانگی قورئانە، شەوی دابەزینی ئەو خەڵاتە مەزنەش، شـازادەی شـەوانی ڕەمـەزانو گەورەی هەموو شەوانی ساڵەو هێندە گەورەیە، کە بەرامبەر هەزار مانگە!

ڕەمەزان، یاداشتی گەورەترین یادگاریی کەون!

ئێـوارەی گەڕانـەوەی نازدارتریـن مـرۆڤ لە یەکەمیـن دیداری فریشتەی ئاسمانو بیسـتنی یەکەمین ئاوازی بەهەشتیی سەدای ﴿ ٱقۡرَأۡ ﴾ ـە..

ئێستا لەگەڵ ئەم وشانەدا، ناخم دەلەرزێ، هەژانێك وەك زەمینلەرزە، سەراپای ڕۆحو جەستەی داگرتووم!

ئێسـتا وا لـە بەرچاومە، پەیامبەر گەڕاوەتـەوە بۆ ماڵو خۆی لە باوەشـی پڕمیهری خەدیجەدا شـاردۆتەوەو لە هەیبەتـی ئەو دیدارە گەورەیەدا داوا دەکات «زملوني، زملوني».

ئێستا دەبینم، زەنگۆڵ زەنگۆڵ گوڵاوی ئارەقی نبوەت بەسەر گۆنای مونەوەریدا دێنە خوارێ!

دەبێت سـەداو زایەڵەی ﴿ ٱقۡرَأۡ ﴾، ئـەو دڵە گەورەیەی چۆن کردبێت بە ئاوریشم!

ئەو پەیامبەرە نازدارە، بە یەك وشەی ئەو قورئانە توایەوە!

چونکە وەرگرتنی پەیامی ئاسمانو وتەی پەروەردگار، خۆ کارێکی هەر وا سانا نییە!

حەسەنی بەسری دەڵێت، پێشینان، قورئانیان بە نامەی خوداوەند دەزانی بۆ ئەوان!

لە شەودا لێی ڕادەمانو بە ڕۆژیش کاریان پێ دەکردو جێبەجێیان دەکرد!

شەوانە، شەوچرایماڵەکانیان بوو، لە خوێندنەوەو بیرکردنەوە لە ماناکانی تێر نەدەبوون..

لەسەر باڵی ڕەشی شەودا، هاوڕێ بە پیتە زیوینەکانی قورئان، باخی دڵیان بە بارانی ئەسرین ئاو دەداو بە سینەی پڕ لە ئیمانیان، نەسیمی فیردەوسیان هەڵدەمژی!

﴿ أَوْ زِدْ عَلَيْهِ وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ﴾ المزمل: ٤ ئای لە شەوانی ئەهلی قورئان!

سەدای قورئانو دەنگی گریانە

گزەی دەروونی ئەهلی ئیمانە

هاوارەو نزاو تکایەو ڕەجا

داوای ڕەحمەتو میهرو غوفرانە

موحەممەدی کوڕی کەعبی قورەضی دەڵێت: « هەر کەسێك قورئانی پێ گەیشتبێ، وەکو ئەوە وەهایە، کە خودای گەورە، خۆی گفتوگۆی لەگەڵ کردبێت»!

چونکە ئەو قورئانە، بۆ ئەو هاتووەو خـوداى گەورە، رووى وتەو گوفتـارى لەو کـردووە، هەروەکو ئیبنو مەسـعوود دەڵێـت: «کاتێك دەبیسـتى خوداى گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾ گوێى بۆ راديَرە؛ چونکە ئەوە، یا خێرێکە فەرمانت پێ دەکرێت، یا خراپەیەکەو لێى دوور دەخرێیتەوە»!

ئازیزم، هەمـووى چەند رۆژێکەو مانگى قورئان دەبێتە میوانمانو لە ڤیسـتیڤاڵى رۆحدا، دەچینە خزمەتى قورئانى پیرۆزو خۆشـترین سـاتەکانى تەمەنى لەگەڵدا بەسەر دەبەینو جوانترین یادگارییەکانى تەمەنى تێدا تۆمار دەکەین.

چـى لەو کاتە خۆشـترە، کـە لەگەڵ هەموو وتەیەکـى ئەو پەیامە پیـرۆزەدا، هەسـت بـە نەرمبوونـى دڵمـان دەکەینو بـە مەداریجى بەندایەتىو شـکۆى عبوودیەتدا، بەرەو مەقامى عاریفانو خواناسـانو خوداپەرستان هەڵدەکشێین.

ئەو کاتەى دیوەخانى دڵمان، بە چلچراى خۆشەویستىو شەوقو تاسەو ئارامىو تەسلیمبوون بە جەلالو جەمالى خودایى، دەبێتە چراخان!

ئەو کاتەى دەزانین، ژیان لەگەڵ قورئان زۆر جیاوازەو خوێندنەوەى کتێبێك کە هەر لە پێشـەکییەکەیدا نووسـراوە ﴿ ذَٰلِكَ ٱلْكِتَـٰبُ لَا رَيْبَ فِيهِ ﴾ البقرة: ٢ لە هەموو کتێبەکانى دى جیاوازە!

کەواتە: با ئەو ساتە دەگمەنانەی ژیانمان، بەخۆڕا لەدەست نەدەین!
با ڕووی دڵمان بکەینە تیلاوەی قورئانو بە ڕۆحو لاشە لە خزمەتیدا بین!
با گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بینو لە قەدەغەکراوەکانی خۆ بپارێزین!
با لەسەرەتا. لە خودی خۆمانو ژیانی خۆمانو دەوروبەرماندا حوکمی پێ بکەینو بیکەینە چرای ڕێگاو ڕێبازی ژیانمان!

با وەکوو ئینو مەسعوود دەڵێت: پێویستە ئەهلی قورئان بناسرێ بە شەونوێژی کاتێك خەڵکی خەوتوون، بە ڕۆژووی کاتێك خەڵکی بەڕۆژوو نین، بە خەمو پەژارەی کاتێك خەڵکی کەیفخۆشن، بە گریانی کاتێك خەڵکی پێدەکەنن، بە بێدەنگیی.. کاتێك دەوروبەری سەرقاڵی قسەن، بە خشووعی.. کاتێك دەوروبەری، خۆیان بە گەورە دەزانن!

دڵنیام کۆبوونەوەی ڕەمەزانو قورئانو تەراویحو قیام، جەننەتی دڵو لەزەتی بێسنووری ڕۆحە، خودا لە هەمووماني قبووڵ بکات!

پێشوازیی خۆشەویستان چەنــدە شــیرینە، ماڵاواییش دوو هێندە تاڵــە، هۆگربوون بە ئازیزان، چەندە مایەی ئاســوودەیی‌و بەختەوەرییە، دابــڕان‌و جودایی‌و لێکترازانیش، ئەوەندە بەئازارو ناڕەحەت‌و بەئێشە!

ڕۆژانێکــە، لەگەڵ ڕۆژە پیرۆزەکانــی ڕەمەزاندا ڕاهاتووین‌و لە جوانتریــن ژوانــی ئەوینی خوداییــدا، وادەمان دانــاوەو ئاوێتەی مەراســیمی بەندایەتی‌و ڤیســتیڤاڵی خوداپەرستی‌و نوێکردنەوەی ئیمان‌و تازەکردنەوەی پەیمانین!

لە ڕەمەزاندا، نیگای شەرمن‌و هەنگاوی هێمن‌و سۆمای بەئەسرین‌و دەستی بەخشین‌و دڵی نەرم‌و باوەشی میهرو بەزەیی، جوانترین تابلۆی بەهەشتی دەنەخشێنین!

شــەوانی تەراویــح‌و قیامی دەیەی کۆتاشــەوانی قەدرو هەنیســکی ســەحەرو ســفرەی پارشــێوو خوانی مەحەببەتی ئیلاهی، زەحمەتە هەرگیز لە ئەرشیفی دڵی عابیداندا بسڕێنەوە!

دەنکەخورمــا شــیرین‌و تــەڕو پاراوەکانــی بەربانــگ، نوقڵانەی شادییەکن، هەردەڵێی قاسید، لە بەهەشتەوە هێناونی!

کــێ هەیە لــە خواناســان، "للصائم فرحتان"ی لەیــاد بچێ‌و دوای چێشــتنی فەرحەی یەکەم، بــە ئومێدی فەرحەی دووەمی کاتی لیقای ئیلاهی، درێژە بە ژیان نەدات؟!

ڕۆژەکانی ڕەمەزان گەرمن.. تینوێتی، گەروو وشک دەکات.. برسێتی برستت لێ دەبڕێت!

وەلێ بۆ ڕازیبوونی مەحبووب، هەموو شتێک ئاسانە!

تا خوداوەند ئیزن نەدات؛ دڵۆپێ ئاو ناخەینە سەر لێوی وشکمان پارشێوان لەبەر ئەوە نەبێ، داوەتی ئەو پەروەردگارە مەزنەین، بەو نیوەشەوە، نەماندەتوانی بێینە سەر سفرەو خوان!

ئازیزم... ڕەمەزان وەرزی پەروەردەکردنی دەروونو پاککردنەوەی ڕۆحو سپیبوونەوەی دڵە!

مەدرەسەی وەرگرتنی بڕوانامەی زوهدو دونیانەویستیو یەکلابوونەوەیە بۆ خودا!

مانگی ڕاگەیاندنی وەلائو خۆشەویستییە بۆ خودای گەورەو ئەولیاو خۆشەویستانیو بەرائەتە لە ئیبلیسو پێڕو ئەولیاو دۆستەکانی!

مانگی تەسلیمبوونی تەواوە بە خوداو گەڕانەوەیە بۆ لای ئەو ئیلاهە گەورەیە!

هەستکردنە بە قوربی ئیلاهی!

﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ ﴾ البقرة: ١٨٦

مانگی ژیانە لەگەڵ نووری قورئانو میشکاتی نبوەتدا..

مانگی ئاوێتەبوونی ڕۆحە، لەگەڵ پیتە زێڕینەکانی قورئاندا..

مانگی ڕامانو بیرکردنەوەو تێگەیشتنە لەو پەیامەی کە خوداوەند لە وەسفیدا دەفەرموێت:

﴿ لَّا يَأْتِيهِ الْبَاطِلُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ ﴾ فصلت: ٤٢

تێگەیشتنە لە مانای (ئیمساك)!

خۆ ڕۆژووگرتن بەتەنێ، خۆگرتنەوە نییە لە خواردنو خواردنەوە! لە سەرپێچیو تاوان، بۆ ماوەیەکی دیاریکراو.

ئەنجامدانی بەندایەتی نییە، تەنها لە (٣٠) ڕۆژدا!

ئێمـــە تەنها لەم مانگەدا، بەندەی خودا نین! بەڵکو هەروەکو چۆن، خــودای گەورە هەمیشـــە خودای ئێمەیە، ئێمەش هەمیشـــەو هەردەم، بەندەی ئەوین!

ئەم مانگە، وێســـتگەیەکی پڕ لە وزەو قوتابخانەیەکی پڕ لە وانەو سەربازگەیەکی ڕاهێنانو مەیدانێکی عەمەلی سوارچاکیو مەردایەتیو بەندایەتی ڕاستەقینەیە!

ئازیزم، دڵنیام کاتێ ئەم نامەیەم دەخوێنیتەوە، بە لاشە لە میحرابی بەندایەتی خۆتیو لەسەر بەرماڵە چکلۆکەت، دەستە چکۆلەکانت، ڕووەو ئاسمان بڵند کردووەو ئەسرین بەسەر گۆنای نوورانیتدا دێتە خوارێ!

وەلێ بە خەیاڵ، لەگەڵ ئەو کەسەدا دەژی، کە لەم شەوانەدا، ئیزاری تونــد دەکردو مەچەکی هەڵدەماڵیو دە شـــەوی ئەخیـــری، جیاوازتر لە هەموو شـــەوانی دی، ئاوەدان دەکـــردەوە، بە خوێندنەوەی قورئانو موناجاتی ئیلاهیو ژوان لە میحرابی ئەوینی خودادا!!

خەیاڵ دەتباتە ئەو شـــارەی کە لـــە دوارۆژەزاندا، جبریلی ئەمین،

دوو جار مودارەسەی قورئان، لەگەڵ پێغەمبەری نازداردا دەکات!

پەیامبەر بە فاتیمەی کچە زێدە ئازیزەکەی گوت: کچی من، ساڵانە جبریـــل، یەك جـــار قورئانی لەگەڵـــدا دەخوێندم، ئەم ســـاڵ دووجار مودارەسەی لەگەڵدا کردم، هەست دەکەم مەرگم نزیك بۆتەوە... رواه مسلم

کـــێ دەڵێ، تا ڕەمەزانێکی دی، مـــەرگ مەودامان دەدات؟ کێ دەڵێ دەتوانین لـــە ڕەمەزانێکی دیدا، قورئانی پیـــرۆز بکەینە باوەشو تێر بە سینگمانەوە بیگووشینو تێر تێر لە خزمەتیدا، فرمێسك بڕێژین!

ئای چەند خۆشە، ژیان لەگەڵ قورئان، لەم مانگە پیرۆزەدا، هەموو کەون، دەبێتە دەنگو سەدای قورئان!

لە ڕێگاوبان، لەنێو ماشێندا!

لە ڕادیۆو تەلەفزیۆندا، لە مزگەوتدا، لەنێو ماڵو کۆڕو کۆبوونەوەدا!

خۆزگە هەمیشە ئاوا، لەگەڵ قورئاندا هاوڕێ باین!

ئەم ئوممەتە، تاکە بەڵای گەورەی، دوورکەوتنەوەیە لە قورئان!

ئەو کاتەی قورئانمان ون کردو لە شـــانۆی ژیان دوورمان خستەوە، ئیدی دەرگای ســـەرگەردانیو نەهامەتیو هەناسەســـاردیمان بە ڕوودا کرایەوە!

قورئـــان بەرنامـــەی ژیانو دەســـتووری وڵاتو ســـەرچاوەی ئاکارو نەخشەی بەختەوەریی دنیاو ئاخیرەتمانە!

ئەم پەڕاوە، تەنها بۆ موبارەکیو خوێندنەوەی لە ئاهەنگو بۆنەکاندا نییە! بۆ ئەوە نییە، ساڵی جارێك ئاوڕی لێ بدەینەوە!

ئەم قورئانە بۆ ئەوە هاتووە؛ دوای بکەوین، نەك دوامان بکەوێ!

لــە قورئاندا، پەردەی تاری ســەر چاوەکانمــان لا دەبرێو هەموو ڕاستییەکان، وەکو خۆی دەبینینو حەقو باتڵ لێك جودا دەکەینەوە!

ژیان،

مردن،

سەربەرزی، ئازادی،

سەرفرازی،

بەختەوەری،

مرۆڤبوون،

تەنها لە قورئانەوە بەتەواوی دەیانناسینو پێیان ئاشنا دەبین!

پێغەمبەری نازدار دەفەرموێت: (الْقُرْآن شَافِع مُشَفع وَمَاحِل مُصَدَّقٌ، مَنْ جَعَلَــهُ أَمَامَــهُ قَادَهُ إِلَى الْجَنّةِ، وَمَــنْ جَعَلَهُ خَلْفَ ظَهْرِه سَاقَــهُ إِلَى النّارِ) صحيح ابن حبان، واسناده جيد.

پێغەمبــەری ئازیزﷺ لــە فەرمووددەیەکدا، کە هەردوو پێشــەوای فەرموودەناســان: ئیمامی بوخاریو موســلیم ڕیوایەتــی دەکەن، زۆر جوان ئەم سەردەمەی ئێمە، وێنا دەکاتو دەفەرموێت:

إنَّ اللهَ لا يقْبضُ العِلْمَ انْتِزاعًا يَنْتزعُهُ مِنَ العِبادِ ولكنْ يقْبِضُ العِلْمَ بقبْضِ العلماءِ حتَّى إذا لمْ يُبْقِ عالمًا اتَّخذَ النَّاسُ رُءُوسًا جُهَّالًا فسُئِلُوا فأفْتَوْا بغيرِ علمٍ فضلُّوا وأضلُّوا

واتــە: خودا زانســت لــە بەندەکانی ناســەنێتەوە، بــەوەی لە خەڵکی وەرگرێتەوە، یاخود وەکو لە ڕیوایەتێکی دیدا دەفەرموێت، لە سنگی زانای وەدەردەنێ، بەڵکو بە مردنو لەنێوچوونی زانایان، زانســت لەنێو دەچێت، تا کاتێك زاناکان دەمرنو نامێنن، خەڵکی سەرانی نەزان، دەکەنە پێشەوای خۆیان، ئەوانیش کاتێك پرســیاریان لــێ دەکرێت، بەنەزانی فەتوا دەدەن، بەو کارەش خۆیانو شوێنکەواتووانیان گومڕا دەکەن!

زانایانــی ئیســلام، جێگری پێغەمبەرو واریســی نــووری نبووەتن، خوداوەند پەیمانی لێ وەرگرتوون، کە ئەو پەیامەی پێیان بەخشراوە، دەبێ بیگەیەننو هیچ زانســتو زانیارییەك لە خەڵکی نەشارنەوە، ﴿وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ لَتُبَيِّنُنَّهُۥ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُۥ﴾ آل عمران: ١٨٧.

چونکە مەقامی ئەوان سەختەو ناکرێ هەرگیز بەیانی هەقو ڕاستی فەراموش بکەن. ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلْنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلْهُدَىٰ مِنۢ بَعْدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِى ٱلْكِتَٰبِ ۙ أُوْلَٰٓئِكَ يَلْعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ﴾ البقرة: ١٥٩.

چونکە ئەوان کەسانێکن، بە ئیختیاری خۆیان، ئەو مەقامە بەرزەیان

هەڵبژاردووەو کەسێکیش کە لەو پلەیەدا بێت، دەبێت وەها بێت، کە خوداوەند وەسفی دەکات.

﴿ ٱلَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَٰلَٰتِ ٱللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُۥ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلَّا ٱللَّهَ ﴾ الأحزاب: ٣٩

ئـەوان چۆن وەها نابن، لە کاتێکدا دەزانن ﴿ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبًا ﴾ الأحزاب: ٣٩

زانایـان مەرجەعی عیلمو مەئمەنـی کاتی خەتەرو چرای زەمەنی فیتنـەن.. ئەوان شـوهەدای خودان بەسـەر ئەم ئوممەتـەوە لە دوای پێغەمبەر!

خوداوەند لە دووی خۆیو فریشتەکان، وانی کردووە بە گەواهیدەر لەسـەر وەحدانیەتی خۆی ﴿ شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَأُو۟لُوا۟ ٱلْعِلْمِ قَآئِمًۢا بِٱلْقِسْطِ ﴾ آل عمران: ١٨

وەلـێ نەمانـی زانایانـی شـەرعناسو لەخواتـرسو چاونەترسو ڕاستگۆو دنیانەویستو ئاخیرەتویست، لە نیشانەکانی ئاخیری زەمانەو پێغەمبـەری ئازیزمان فەرموویەتـی: (لە نیشـانەکانی ئاخر زەمان، نەمانـی عیلمو زانیـنو بڵاوبوونەوەی نەزانیو جەهلـە) -بوخاریو موسلیم-

زانایانی پێشین، وەها تەعزیمی خودا، دڵو دەروونی داگیرکردبوون، کە هیچ هێزو تواناو دەسـەڵاتێك، هەیبـەتو مەکانەتی لەنیو دڵیاندا نەمابوو!



ترسی خودا جێگای بۆ ترسو پەروابوون لە کەسی دی نەهێشتبووەوە!

بۆیە بووبوونە سـولتانی دڵو گیانی خەڵكو پێشەوای ڕاستەقینەی ئەهلی ئیسلام!

ئەوان دونیایان خستبووە ژێر پێو چاویان لە مەتاعی فانیی ئەم دونیایە نەبوو، زوهدو تەقواو وەرعو بۆخواژیانو بۆخواسوڵحان، سیمای هەمیشەیی زانایانی ڕەببانیو ئەهلی حەقە!

نە لە کەس دەترسانو نە چاویان لە دەستی کەس بوو، نە بەهیوای خەڵاتی کەس بوون، جگە لە خودای گەورە.

سـولەیمانی کـوڕی عەبدولمەلیك، چوو بۆ لای سـەلەمەی کوڕی دینار، کە یەکێکە لە تابعینو پێشـتر کۆیلەیەکی خەڵکی وڵاتی فارس بوو، لێی پرسی: ئەبوحازم، بۆ ڕقمان لە مردنە؟!

ئەویش لە وەڵامدا گوتی: چونکە ئاخیرەتی خۆتان وێران کردووەو دونیاتـان ئاوەدان کردۆتەوە، هەڵبەت کەسـیش پێـی خۆش نییە، لە ئاوەدانییەوە، بچێت بۆ وێرانە!

گوتی: ڕاست دەکەیت..!

پاشان لێی پرسی: گەڕانەوە بۆ لای خودا چۆنە؟!

سـەلەمە لە وەڵامـدا گوتی: مرۆڤـی چاکەکار وەك موسـافیرێك بگەڕێتـەوە بۆ نێو مـاڵو منداڵی، خراپەکاریـش وەك کۆیلەیەك، لە گەورەکانی هەڵاتبێو بگەڕێتەوە بۆ لای!

سولەیمان گریاو گوتی: خۆزگە دەمانزانی، چیمان هەیە لای خودا!

سـەلەمە گوتی: خۆت نمایش بکە بەرامبـەر قورئانی پیرۆز، ئەو کات دەزانی لای خودا چۆنی!

پرسی لە کوێدا بزانم؟ گوتی: خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ لَفِى نَعِيمٍ وَإِنَّ ٱلْفُجَّارَ لَفِى جَحِيمٍ ﴾ الانفطار: ١٣ - ١٤

جارێکی دی سولەیمان پرسی: ئەی کوا ڕەحمەتی خودا؟

سەلەمە گوتی: ﴿ قَرِيبٌ مِّنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾ الأعراف: ٥٦

سـولەیمان داوای ئامۆژگاری لێ کرد! سەلەمەش پێی گوت: بترسە لـە خودا، کە لە شـوێنێك بتبینێ، کە پێی خۆش نییە! لە شـوێنێ نەتبینێ کە پێی خۆشە بتبینێ..

دواتر داوای دوعای خێری کرد!

سـەلەمەش گوتی: خودایە، ئەگەر سـولەیمان خۆشەویستی خۆتە، ڕێگای خێرو چاکەی بۆ ئاسـان بکە، ئەگەر دوژمنی تۆشە، نێوچەوانی بگرە بەرەو چاکە!

هـەر ئـەم پیاوە بـەرزە دەڵێت: زانایانـم بینی، کە میرو پاشـاو سوڵتانەکان لەبەر دەرگاکانیان، وەکو کۆیلە ڕاوەستابوون! بەڵام ئەمڕۆ زانایـانو خواپەرسـتان، خۆیان دەچنـە بەر دەرگای میرو سـوڵتانو دەوڵەمەنـدەکان، کاتێکیـش ئەوەیـان بینـی، لەبەرچاویـان کەوتنو بەسووك تەماشـایان کردن؛ چونکە لە دڵی خۆیاندا دەیانگوت، ئەگەر

ئه‌وه‌ی به‌ده‌ســـت ئێمه‌وه‌یه‌، باشتر نه‌بێ له‌وه‌ی به‌ده‌ستی ئه‌وانه‌وه‌یه‌، نه‌ده‌هاتنه‌ به‌ر ده‌رگامان!!!

ســه‌باره‌ت به‌ دونیــای فانیش ده‌ڵێت، ئه‌وه‌ی له‌ دونیا ڕۆیشــتووه‌، خه‌وبوو، ئه‌وه‌شی ماوه‌ته‌وه‌، ته‌نها خۆزگه‌یه‌!

هه‌روه‌ها ده‌ڵێت، ته‌ماشا بکه‌، ئه‌وه‌ی حه‌ز ده‌که‌ی له‌ قیامه‌تدا له‌گه‌ڵتدا بێت، له‌ ئێســتاوه‌ بینێره‌ بۆ ئه‌وێ! ئه‌وه‌شــی که‌ پێت ناخۆشه‌ له‌گه‌ڵت بێ، له‌ ئێستاوه‌ وازی لێ بهێنه‌.

ســه‌باره‌ت بــه‌ دوژمنی سه‌رســه‌ختی هه‌موانیش ده‌ڵێــت، ئیبلیس چییه‌؟ گه‌ر لێی یاخی بیت، هیچ زیانێك ناگه‌یه‌نێت.. به‌ فه‌رمانیشــی بکه‌ی، هیچ سوودێکت پێ ناگه‌یه‌نێت.

ڕه‌حمه‌تی خودا له‌ سه‌له‌مه‌ی کوڕی دینار

کاتێك تەماشــای ژیانی زانایانی پێشین دەکەین، سەرسام دەبین بەنــاکاری بەرزو هیممەتی بڵندو دنیانەویســتیو بۆ خوداســولحانو ڕووکردنە ئاخیرەتو پشتکردن لە دنیا!

ئەو کات دەزانین کە بە مانای وشــە واریسی نبوەتو جێگری پێغەمبەر بــوون (دروودی خودای لێ بێت)، جگە لە ڕازیکردنی خوداو دەســکەوتنی لێبوردنی خودایی، هیچ خەمو پەژارەیەکیان نەبووە!

هەرگیز ڕێگایان نەداوە، خۆشەویســتی دونیاو مەتاعی فانیی ئەم دنیایە، بێتە بەر دەرگای دڵیان، نەك بتوانێ ڕەگ دابکوتێ!

ئەبو ســلێمانی دارانی دەڵێت: ئەگەر ئاخیــرەت لەنێو دڵدا بێت، دونیــا دێتو موزاحیمی دەبێت، وەلێ ئەگەر دونیا لە نێو دڵدا بێت، ئــەوا ئاخیرەت موزاحیمی دونیا نابێــت؛ چونکە ئاخیرەت بەڕێزەو دونیا بێ ڕێز!

ئەو زانا بەڕێزانە، هەرگیز دینیان نەکردبووە پەیژەیەك بۆ دونیا، دونیایان بەدینیان سەودا نەدەکرد!

فوزەیلی کوڕی عەیاز دەڵێت: ئەگەر بە دەهۆڵو زوڕنا، داوای دونیا بکەم، پێم خۆشترە لەوەی بەخواپەرستییەکەم داوای بکەم!

ئیمامــی شــافیعیش دەڵێت: هیچ عەیبێك بۆ زانــا لەوە گەورەتر نییە، کە داوای زوهدو دنیانەویستی لە خەڵکی بکاتو خۆشی باوەشی پێدا بکات!

چونکە خۆشەویســتی دونیا، دڵی خواناســانو زانایان دەمرێنێو

بەرەکەتی زانستەکەیان ناهێڵێ.

پرسـیار لە مالیکی کوڕی دینار کرا: سـزای ئەو زانایە چییە کە دونیای خۆش دەوێت؟! لە وەڵامدا گوتی : دڵی دەمرێت!

کەسـێکیش دڵی مردبێت، ئیدی تروسـکەی نووری بەسیرەت لە نێو دڵیدا نامێنێت.

ئەوان دەیانزانی دانیشتن لەسەر مینبەری شەریعەتو پێشەوایەتی لە میحرابی نبوەتدا، کارێکی وەها ئاسان نییە!!

دەیانزانی زانسـت بەتەنێ، مێزەری زلو بڕوانامەی گەورەو ناوو نازناو نییە!

کابرایەك بەرامبەر بە فەتوایەکی حەسەنی بەسری گوتی: فوربان فوقەها پێچەوانەی ئەم قسەیەی جەنابتان دەفەرموون!

لـە وەڵامدا حەسـەن پێی گـوت، داماو، بۆ تۆ تا ئێسـتا فەقیهت بینیوە؟! واتە گەیشـتووی بەخزمەتی یەکێك، کە شـایانی ئەوەبێت پێی بگوترێت فەقیه!؟

چونکە حەسەنی بەسری، هەرخۆی تاریفی فەقیه دەکاتو دەڵێت: (فەقیه ئەو کەسەیە، زاهیدە لە دونیا، پەرۆشە بۆ ئاخیرەت، بەسیرە بە دین، خوداویسـتو خواپەرسـتە، دوورەپەرێـزە لە حەرام، زمانی پاکـە بەرامبەر موسـوڵمانانو چـاوی لە ماڵیان نییـەو ئامۆژگاریی خێرییان دەکات).

ئیبراهیمـی حەربـی لەلایەن خەلیفـەوە دەهـەزار درهەمی بۆ

دێت، تا نەك بۆ خۆی، بەڵکو بەسـەر دراوسـێکانیدا دابەشـی بکات، ئەویـش بەنێردراوی خەلیفەی گوت: سـەلامەت بی، ئەمە پارەیەکە ئێمە خۆمان بە کۆکردنەوەیەوە خەریك نەکردووە، ئێستاش خۆمان بەدابەشـکردنییەوە خەریـك ناکەیـن! پێی بڵێ: ئەگـەر وازمان لێ ناهێنێت، لێرە بار دەکەینو دەگوازینەوە!

هەربۆیە دەسـەڵاتدارو دەوڵەمەندان، لە مەجلیسـیاندا بەزەلیلی ڕادەوەستان!

زانایەکی وەکو ئەعمەش کە خاوەنی یەك درهەم نەبووە، دەگێڕنەوە کە دەسەڵاتدارو سـوڵتانو بازرگانەکان، هەرگیز هێندە زەلیلو داماو نەبوون، کە لە مەجلیسی ئەعمەشدا دادەنیشتن!

ئەوان هەرگیز بەرامبەر بە ئەهلی دونیا، خۆیان بەکەم نەدەزانی؛ چونکە وەکو ئیمامی ئەحمەد دەیگوت: جیاوازی نێوانمان تەنها (إنما هو طعام دون طعام، ولباس دون لباس، وإنها أيام قلائل).

واتە: تەنها ئەوەندەیە نێوانمان جلوبەرگمان لە خوار جلو بەرگی ئەوانەو خواردنمان لە خوار خواردنی ئەوان، هەمووی چەند ڕۆژێکی کەمەو جێی دێڵین!

دڵانێك کـە بەنـووری محەببەتی ئیلاهیو عەزەمـەتو جەلالی خودایـی، ئاوەدان بێت، ئیدی چۆن ئاوڕ بۆ لای کەسـانێك دەداتەوە، کە جگە لە مەتاعی پووچی دونیا، هیچی دییان نییە، وێڕای ئەوەش بەیانیو ئێوارە لە غەزەبی خودادا دێنو دەچن.

سوفیانی سەوری دەڵێت: ئەگەر زانات بینی، پەنا بۆ دەسەڵاتدار دەبات ئەوە دزە، ئەگەریش پەنای بۆ دەوڵەمەندان برد ئەوە ڕیابازە!

ئەو زانا بەڕێزانەی شەوانیان بە زیکرو موناجات لەگەڵ خودای بەقوڕگی پڕگریانو چاوی پڕئەسرینەوە بەسەر دەبرد، بە ڕۆژیش کاری سەرەکییان فەرمان بەچاکەو نەهی لەخراپە بوو، ڕوونکردنەوەو بەیانی حەقو ڕاستیو دینی یەکتاپەرستی بوو!

ئەوان حوججەتی ئیلاهیو بەڵگەی نبوەت بوون، ڕێنیشاندەری سیراتی موستەقیمو شاڕێگای ڕزگاریو سەرفرازی بوون!چرای زەمەنی فیتنەو نەجاتی سەردەمی هەلاکەت بوون.

گەر ئەو زانایەنە نەبن، جارێکی دی تارمایی ڕەشی جاهیلییەت هەموو جیهان دادەپۆشێت!

ئەوان چرای نوورو ئەستێرەی هیدایەتن، درێژەپێدەری ڕێگای پێغەمبەرانن!

لەم زەمانی فیتنەو دورکەوتنەوە لە نووری نبوەتو ڕێبازی سوننەتو جەهل بەشەریعەتەدا، زۆر گرنگە دەست بگرین بە زانستی زانایانی ڕاستگۆو دڵسۆزو خواناسو لە خواترس!

ئەوان ئەمینداری نێوان ئێمەو خودان، ڕوونکەرەوەی حەڵاڵو حەرامو چاکەو خراپەو باوەڕو بێ باوەڕین.

دەبا سەرچاوەو مەرجەعی هەموو کاروباری ژیانمان بن!




# نامەی پەنجاو حەوت

لە هەردوو کۆتانامەی ڕابوردوودا، سـەبارەت بە زانایانی ڕاستەقینەو شارەزایانی شـەریعەتو خوداناسانی حەقیقی بۆم نووسیبووی، ئەوانەی خودای گەورە شایەدییان بۆ دەدات کە بەڕاستی لە خودا دەترسن..

﴿إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَٰٓؤُا﴾ فاطر: ٢٨.



پێشەوا عەلی کوڕی ئەبوتالیب، بە یەکێک لە هاوڕێکانی دەڵێت: خەڵکی سێ جۆرن: زانایەکی ڕەببانی، قوتابییەک کە دەیەوێت فێری زانستێک بێت کە ڕزگاری بکات، کەسانێک کە عەوامو نەزانن و شوێنی هەموو دەهۆڵێک دەکەونو بە هەموو بایەک شەن دەکەنو شوێنی هەموو کەسێک دەکەون کە بانگیان بکات، ئەمانە نە لە نووری زانست بەهرەمەند بوون، نە دەستیان لە پایەیەکی بەهێز گیربووە!

هیچ کارێکیش بێ زانستو شارەزابوون، سوودی نییە، عومەری کوڕی عەبدولعەزیز دەڵێت:

هەرکەسێک کارێک بکات بەبێ عیلم، ئەوەی خراپی دەکات، زۆر زێترە لەوەی کە چاکی دەکات.

زوهری دەڵێت: هیچ عیبادەتێک لە فێربوونی عیلم، گەورەتر نییە.

زانای ڕاستەقینەش، ئەو کەسەیە کە کار بە زانستەکەی بکات، ئەو خێرەی کە فێری بووە، کاری پێ بکاتو ئەو شەڕەی ناسیویەتی، خۆی لێ بپارێزێت!

زانای ڕەببانی جگە لە خودا، لە کەسی دی ناترسێو دینی خودا ناشارێتەوەو لە پێناو گەیاندنی ڕاستیدا، بەخشینی ڕۆحی خۆی زۆر بە لاوە ئاسانە!

وەهبی کوڕی مونەببیه دەگێڕێتەوە کە لە بەنی ئیسرائیلدا، پاشایەکی ستەمکار هەبوو، لەسەر نەخواردنی گۆشتی بەراز، خەڵکی دەکوشتو بە

زۆر دەرخـــواردی دەدان، تـــا کار گەیشـــتە یەکێك لە پیـــاوە خوداناس و صالحەکان!

بەرپرســـی پۆلیس و دەســـتوپێوەندی پاشـــا، بە کابرایان گوت: ئێمە لەبری بەراز، کارژۆڵەیەکت بۆ ســـەردەبڕین، کاتێك پاشـــا بانگیکردیت و زۆری لێ کردیت بیخۆ، ئێمە بەدزییەوە، لەبری گۆشـــتی بەراز، گۆشـــتی کارژۆڵەیەکت بۆ دادەنێین!

بـــەڵام کاتێك کابرایـــان هێناو داوایـــان لێ کرد، نەیخوارد! پاشـــاش فەرمانی دا کە بیبەنە دەرەوەو لە گەردنی بدەن!

لێیان پرســـی بۆ نەتخوارد؛ تا ڕزگارت بێت، خۆ ئەوە گۆشـــتی بەراز نەبوو؟!

لـــە وەڵامـــدا گوتی: من کەســـێکم، خەڵکی چاوم لێ دەکاتو شـــوێنم دەکەوێت، نەمویست لە گوناهو سەرپێچیکردنی خودادا پێشەوایان بم!

پاشان بە فەرمانی پاشا، سەری لە گەردنی جودا کرایەوە!

جەعفەری کوڕی محەممەد، لە مەجلیسی ئەبوجەعفەری مەنسووردا دانیشتبوو، مێشێك ئەبوجەعفەری هەراسان کردبوو، هەر دەری دەکردو دەگەڕایەوە.

ئەبوجەعفەر پرسیاری لێ کرد: خودا بۆچی مێشی درووست کردووە؟

جەعفەر گوتی: بۆئەوەی ملهوڕەکانی پێ زەلیل بکات!!

ئـــەو کەســـەی ڕازیبوونی خودا، تاکـــە هیواو ئاواتییەتـــی، چاوی لە خەزێنەی ئیلاهییەو جگە لە دەستی کەرەمی خودایی، چاوی لە دەستێکی دی نییە، باکی بە هیچ خاوەن دەسەڵاتو ستەمکارو ملهوڕێك نییە!

شێخولئیسلام ئیبنوتەیمیە. کاتێک چوو بۆ لای قازانی پاشای تەتەر بە وەرگێڕەکەی گوت: بە قازان بڵێ: تۆ بانگەشەی ئەوە دەکەیت کە موسڵمانیو بانگبێژو قازیو ئیمامو زانات لەگەڵن، ئەی بۆچی پەلامارى وڵاتەکەمانت داوە؟!

باوکتو هۆلاکۆی باپیرت کافربوون، بەڵام هێرشیان نەهێنایە سەر وڵاتی ئیسلام، مەبەستی دیمەشق بوو، بەڵام تۆ غەدرت کردو پەیمانت شکاندو وەفات بۆ عەهدو پەیمانت نەبوو!!

دواتــر کۆمەڵێـک گفتوگــۆ، لــە نێــوان شێخولئیســلامو قــازانو دەســتوپێوەندیدا ڕووی داو زۆر چاونەترســانە وەڵامــی دەدانەوەو لە خودا نەبێ، لە کەس نەدەترسا!

پاشــان خواردنیان هێناو فەرموویان لە ئیبنوتەیمیە کرد، زانایانی دی خواردیان، بەڵام ئیبنوتەیمیە نەیخوارد! لێیان پرسی بۆ ناخۆی؟

ئەویــش لە وەڵامدا گوتی: چۆن خواردنی ئێــوە بخۆم لە کاتێکدا هەمــووی مەڕوماڵاتی خەڵکەو زەوتتان کــردووەو ئەو دارەش ئاگرتان پێ کردووەتەوە، لە ڕەزو باخی خەڵکی هەژارو لێقەوماوە!

پاشــان قازان داوای دۆعای خێری کــرد! جا بزانن چۆن دۆعایەکی کرد:

لە نزاکەیدا گوتی: خودایە، ئەمە بەندەی تۆیە، مەبەستی قازان بوو، ئەگەر لەپێناو بەرزڕاگرتنی دینی تۆ دەجەنگێ، خودایە سەرکەوتووی بکەی، یارمەتیدەری بیو بیلادو عیبادی بخەیتە دەست. بەڵام خودایە

ئەگەر تەنها بۆ ڕیابازیو ناوو شۆرەتو دەسکەوتنی دونیاو زەلیلکردنی ئیسلامو بەرزکردنەوەی ناوی خۆی وا دەکات، خودایە زەلیلی بکەی، هێزو دەسەڵاتی تێك بشکێنیو دوای ببڕیت!

قازانیش لە دوایەوە، ئامینی دەکرد!

ئەو زانایانەی کە لەگەڵیدا ئامادەی ئەو دیدارە بوون، خۆیان گرمۆڵە کردبوو، لە ترسی ئەوەی نەبادا لەو کاتەدا کە قازان ملی ئیبنو تەیمیە دەپەڕێنێ، خوێنەکەی بەر جلی ئەمان بکەوێت!

دواتر لێی تووڕە بوونو گوتیان: ئەوە تۆ دەڵێیت چی، خەریك بوو هەموومان بە هیلاك بەری، لەوێدا لێی جیا بوونەوەو لە ترسا نەیانوێرا لەگەڵیدا بگەڕێنەوە!

بەڵام شێخولئیسلام بەسەلامەتیو بە پێشوازی دەیان کەس لە میرەکانی قازان، کەبۆ موبارەکی هاتبوونە دیداری، گەیشتەوە دیمەشقو ئەوانی دی لە ڕێگا جەردە ڕووتی کردبوونەوە!

پێشینان ڕاستیان گوتووە: ئەوەی تەنها لە خودا بترسێ، هەموو خەڵکی لێی دەترسن، بەڵام ئەوەی لە خودا نەترسێ، بەڕاستی لە هەموو خەڵکی دەترسێ!

شەوە درێژەکانی پاییزە ئازیزم،.....

بۆ خواویستانو عابیدان غەنیمەتە، ئەم وەرزە لای ئەولیایانی خودا، وەرزی ئاڵتوونیی عیبادەتو خواپەرستییە! ڕۆژانی کورت بۆ ڕۆژووگرتنو شەوانی درێژ بۆ موناجاتو نوێژو نزاو پاڕانەوەو یادی خودا!

ئەمە خولیای بەندەکانی خودان، ئەوانەی بەڕاستی بەندەی خودان!

چونکە مرۆڤ بەندەی ئەو شتەیە، کە تەوقی کۆیلایەتی بۆ کردۆتە گەردن، ئەوەی ئەسـیرو بەندی کۆتو زنجیری نەفسی خۆیەتی، ئەوە بەندەی نەفسە، نەك بەندەی خودا!

ئـەوەی کۆیلەی دونیایەو شـەوو ڕۆژ لە خزمەتـی ئەودایە، ئەوە بەندەی دونیایە، نەك بەندەی خودا!

خـۆ بـوون بە بەندەی خـودا، هەر ئاوا ئاسـان نییـە، زۆرن ئەو کەسـانەی کە وا دەزانـن بەندەی خودان، بەڵام لە ڕاسـتیدا، بەندەی نەفسو هەواو ئارەزووەکانی دونیاو شەیتانن، بەڵام دانی پێدا نانێن!

یەکێك لە پیاوچاکان، کابرایەکی بینی، لێی پرسی: پیشەت چییە؟

گوتی: خەربەندەم، بە فارسی واتە: بەندەی گوێدرێژەکەمم!

خۆ کەسانی وەها زۆرن، بەڵام ناتوانن وەك ئەم کابرایە ڕاستگۆ بن!

پێغەمبـەری ئازیز دەفەرموێـت: (تعس عبد الدرهـم، تعس عبد الدينار...) البخاري.

چـی بەڵایەکی گەورەیە، کـە پێغەمبەر دوعا لـە بەندەی دینارو

دڕهەم بکاتو دوعای داماویو خەسارەتمەندییان لێ بکات!

کاتێك مرۆڤ زۆربەی ساتەکانی ژیانی بۆ جەمعی دونیای فانیو کۆکردنەوەی مەتاعی دونیایەو دڵی وابەستەی پارەو سامانو زێڕو زیوەو لە نوێژەکەشیدا خەیاڵی هەر لای پارەکانێتی، ئیدی چۆن لافی بەندایەتی بۆ خودا لێ دەدات؟!

چونکە خۆشەویستیی دونیاو ئالوودەبوونی، یەکێکە لە نیشانەکانی دەردەسەریو داماوی، نەك بەختەوەریو سەعادەت، وەکو خەڵکی گومان دەبەن.

فوزەیلی کوڕی عەیاز دەڵێت: "پێنج شت لە نیشاکانی داماوین: دڵڕەقی، وشکی چاو، بێشەرمی، خۆشەویستیی دونیا، هیوادرێژی بەدونیا".

جا ئازیزم، کەسانێك دەتوانن شەوانی درێژی پاییز، بە چرای موناجاتو قیامو زیکرو خوێندنەوەی قورئان ڕووناك بکەنەوە، کە تامی لەزەتی "بەندایەتی"یان بۆ خودا کردووەو پشتیان کردۆتە دونیای فانیو دڵیان ئاوەدانە بە خۆشەویستیی خوداو نەبوونەتە حەماڵی مەتاعی دونیاو بەندەی پەڕۆو پاتاڵی دونیا!

چونکە هەرکات خۆشەویستیی دونیا، دڵێك داگیر بکا؛ وەها سەرقاڵی دەکات، یادی خودای بیر دەباتەوە، کە تەواو غافڵو بێئاگا بێ، وەکوو مەحوی شاعیر دەڵێت:

خەیاڵی پووچی دونیا، وا دەماغو دڵمی پێچاوە قیامەت هەر مەگەر ڕۆژی قیامەت بێتەوە فکرم

پیاوچاکانی ڕاستەقینە.. چونکە بەڕۆژ ملکەچی فەرمانی خودا بوون، لە شەودا خوداوەند لە ژوانی ئیلاهی پێشوازی لێ دەکردن.

ساتەکانی شەوو کاتەکانی موناجاتی ئیلاهی هێندە لە دڵیاندا شیرین بوو، دڵیان نەدەهات، چۆڵی بکەن.

عەبدوڵلای کوڕی عومەر، حەوزێکی چکۆڵەی هەبوو، پێش ئەوەی بخەوێ، چەندی بتوانیایە، نوێژی دەکرد، پاشان دەچووە جێگای نووستنو هێندەی خەوی باڵندەیەك، تۆزێك چاوی لێك دەنا، پاشان ڕادەپەڕیو دەستنوێژی هەڵدەگرتو دووبارە نوێژی دەکرد، شەوانە چوار پێنج جار، ئەم کارەی دووبارە دەکردەوە!

ئەبوعوسمانی نەهدی دەڵێت: حەوت جار ئەبوو هورەیرەم داوەت کرد، شەوانە خۆیو خێزانەکەیو خزمەتکارەکەی، شەویان دابەش کردبوو بە سێ بەشەوە، سەرەتا یەکێکیان نوێژی دەکرد، دواتر دووەمی هەڵدەستاند، پاشان سێیەم هەڵدەستا!

واتە: شەو تا بەیانی، ماڵیان ئاوەدان بوو بە قیام لە موناجاتی خودایدا!

سەعیدی کوڕی موسەییەب، پەنجا ساڵ نوێژی بەیانیی بە دەستنوێژی نوێژی عیشا کردووە!

هەر ئەو سەعیدە، چل ساڵ لەسەر یەك، بانگ نەدراوە، ئیللا لەنێو مزگەوتدا بووەو چاوەڕوانی نوێژی کردووە.

عەلی کوڕی فوزەیلی کوڕی عەیاز، کە لاوێکی تازەپێگەیشتوو بوو، شەوانە شەونوێژی دەکرد، تا بەسکەخشێ دەچووە نێو جێگاکەی، پاشان ئاوڕی دەدایەوە بۆ لای باوکیو دەیگوت: باوەگیان، خواناسان پێشم کەوتن!

ئیمامی شافیعی، شەوی کردبوو بە سێ بەشەوە: بەشی یەکەمی دەینووسی، بەشی دووەمی نوێژی دەکردو بەشی سێیەمی دەخەوت.

خۆ ئەگەر باسی بەری بەیانو شنەی سەحەر بکەین؛ ئەوە کاتی کۆڕی گەرمی زیکرو ئیستغفاری خواناسانو خۆشەویستانی خودایە، سەداو زایەڵەی ﴿ وَٱلْمُسْتَغْفِرِينَ بِٱلْأَسْحَارِ ﴾ـەو دەنگی گریانوناڵەو ئەنینی ﴿ وَبِٱلْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴾ـە.

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود، کاتی سەحەر دەیگوت: «اللهم دعوتني فأجبتك.. وأمرتني فأطعتك.. وهذا سحر فاغفر لي».

کاتێك لێیان پرسی: بۆچی کاتی سەحەری ئاوا تایبەتمەندکردووە؟

گوتی: کاتێك کە یاقووب پێغەمبەر (درووودی خودای لێ بێ) بە کوڕەکانی گوت: ﴿ سَوْفَ أَسْتَغْفِرُ لَكُمْ ﴾يوسف ٩٨ دوعاکەی دواخست بۆ کاتی سەحەر!

تاوسی کوڕی کەیسان لە کاتی سەحەردا، سەردانی کابرایەکی کرد،



گوتیان خەوتووە!

گوتــی: نەمزانیووە تا ئێســتا کەسـێك هەبێت، کە کاتی ســەحەر خەوتبــێ! واتــە: پێی ســەیربوو، چۆن کەسـێك لەو کاتــە پیرۆزەدا دەخەوێت!

لەگەڵ ئەوەشــدا شــەرمیان لە خودا دەکردو وێڕای خواپەرســتیو عیبادەتــی زۆر، ڕووی ئەوەیان نەبوو، ســەری بەندایەتی بڵند بکەن، بەڵکو هەمیشــە شــەرمەندە دەبوونو تەنها چاویان گوناهو تەقسیری دەبینی!

یەحیای کوڕی مەعازیش دەیگوت: کەسـێك کاتی تاعەت، شەرم لە خودا بکات، کاتی گوناهکردنیش خودا شەرمی لێ دەکات!

باسکردنی ژیانی شەیدایانی شەوو خواناسانی ڕاستەقینە بەردەوامە، تا نامەیەکی دی، بە خودات دەسپێرم!




# نامەی پەنجاوو نۆ

ئەوانـــەی لە نیوەشـــەودا لەنێو جێگاکانیاندا، ئـــەم دیوو ئەودیو دەکـــەنو دوور لەیادو زیکرو موناجاتـــی مەحبووبی خۆیان ، ئۆقرە ناگرنو ناتوانن بسرەون، پەتووەکانیان جێ دەهێڵنو جێگای خەوتن

فەرامۆش دەکەنو بەئەسپایی دەستنوێژ هەڵدەگرنو دەچنە سەر بەرماڵی ئەوینو بەندایەتیو نوێژی دڵ دادەبستن!

کۆتا شەوەکانی پاییز ساردن، خەوی دوای نیوەشەوو دەمەوبەیان خۆشە.

وەلێ هەرگیز لەگەڵ خۆشیو لەزەتی موناجاتی سەحەردا بەراورد ناکرێ!

دەبێ چی هەبێ لە دیداری خۆشەویست خۆشتر!
ئەو کاتەی بانگت حەرفی تێدایە
"مونادا" تەنها زاتی "الله"یە
ڕازونیازت هەر بۆ لای ئەوە
چلچرای عومرە، ئەوە کەی شەوە!!

هەر بۆیە خوداوەند دەفەرموێت: ﴿ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ ﴾ السجدة: ١٦

واتە: جێگاکانیان جێ دەهێڵنو لێیان دوور دەکەونەوە، دێنە نێو دۆعاو نزاو پاڕانەوەو موناجاتی ئیلاهی لە ترسی خوداو سزای ئیلاهی و هاوکات بە ئومێدی بەهەشتی بەرینو پاداشتی خودایی، وێڕای بێداری شەوێو ئامادەبوون لە ژوانی بەندایەتیدا، لە پێناوی خوداو گەیشتن بە پاداشتو ڕازیبوونی زاتی «اللە»دا لەو ماڵو سامانە دەبەخشن کە خودا پێی بەخشیون!

چونکە ئەوەی لە مانای گەورەیی خوداو مەقامی بەندایەتیو

بەرزیی پاداشــتی ئاخیرەت گەشت بێ، زۆر بەسانایی ماڵو سەروەت لە پێناوی خودا دەبەخشێت!

خودای گەورەش لە وەڵامو پاداشــتی کاری ئەو بەندە ساڵحانەی دەفەرموێت:

﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾ السجدة: ١٧خودای گەورە بەشــێوەیەك ڕێز لە شــەونخوونیو فرمێشــکی شەووناڵەی سەحەری بەندە ئەویندارە ڕاستەقینەکانی دەگرێت، کە پاداشتانێکی وەها گەورەی بۆ داناون، کە هیچ کەسێك نایزانێو پەی پێ نابات!

ئــەو بەندانــەی بەپەنهانی لەژێر باڵی رەشــی شــەودا، جێگای نووستنیان جێ هێشت؛ خودای گەورەش بەپەنهانیو نهێنی، پاداشتی هێندە گەورەی بۆ دانان، کە لە هەموو خەڵکی شاردۆتەوەو جگە لە خۆیان، کە لە ڕۆژی دواییدا بە دیداری دڵشــاد دەبنو شادمانییەکی بێســنوور ڕوویان تێ دەکات، کەســی دی نازانێ خودا چی بۆ ئامادە کردوون!

خوداوەنــد هێنــدە کارەکــەی ئەوانی بــە لاوە گرنــگو مەزنە، دەفەرموێت: ﴿ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾ السجدة: ١٧

هــەر لەبەر ئەمە ئازیزم، شــەونوێژ ســیمای ســاڵحینو ئاکاری هەمیشــەییو ســلووکی بەردەوامــی ســالیکینی ڕێــگای ئەویــنو خۆشەویستیو بەندایەتیی خوداوەند بووە!

شــەونوێژو بەخشــینیش دوو کارن، کــە تەنهــا بــە ڕاســتگۆو



موخلیسەکان دەگرێت.

حەسەنی بەسری دەفەرموێت: «هیچ کارێك نییە زەحمەتتر بێت لە شەونوێژو بەخشینی ماڵ»

لێشیان پرسی: بۆچی بێدارانی شەو، ڕوخساریان هێندە جوانە؟

چونکە ئەوان، چوونەتە نێو خەڵوەتی ئیلاهیو خوداوەندیش لە نووری خۆی پێ بەخشین!

ئیبنولقەییم: «هەموو بەندەیەك، دوو وەستانی هەیە بەرامبەر بە خودا؛ وەستانی یەکەم لە نوێژدا، وەستانی دووەم لە بەردەستیدا ڕۆژی دوایی».

ئەوەی مافی وەستانی یەکەمی دابێت لە دونیادا، خودا وەستانی دووەمی بۆ ئاسان دەکات، وەلێ ئەوەی وەستانی یەکەمی بە لاوە گرنگ نەبووبێو ڕێزی نەگرتبێ، خودا وەستانی دووەمی زۆر بۆ قورس دەکات».

لە ترسی ئەو ڕۆژە بوو، پیاوچاکان وەکوو ئێستای ئێمە نەبوون کە بەڕۆژ چوستو چالاك بێنو بچنو بەشەویش تا بەیانی وەکوو لاشەیەکی مردوو لێی بکەون.

مەسرووق دەیگوت: «لەم دونیایەدا، چی ماوە ئارەزووی بکەین، جگە لەوەی کە ڕوخسارمان لە خۆڵ وەردەدەین لە پێناوی خودادا، خەم بۆ هیچ شتێکی ئەم دونیایە ناخۆم، جگە لە شوژدەبردن بۆ خودا».



ئەبوئیسحاقی سەبیعی دەگریا، لێیان پرسی بۆچی دەگریت؟

گوتـــی: پیـــر بووم‌و هێزم لێ بڕاوە، ناتوانم بەپێوە بوەســتم لە شەونوێژدا، تەنها بە خوێندنی بەقەرەو ئالی عیمران نەبێ!

تەماشا کە ئازیزم، ئەم خواناسە دەگری لە شەرمەزاریدا! چونکە شەوانە ناتوانێ زۆر بەپێوە بوەستێ، دوای ئەوەی هەردوو سوورەتی بەقـــەرەو ئالی عیمران بەپێوە دەخوێنێ، کە نزیکی پێنج جزمن لە قورئان، ناچار دەبێت بەدانیشتنەوە نوێژ بکات!!

ئـــەوان بـــە هیممەتی بەرزو ئەوینی ڕاســـتەقینەو دڵـــی ئاوەدان بـــە ئیمان‌و یەقینـــەوە، هەموو کارێکیان لا ئاســـان بوو، ئەوان تامی حەلاوەتی ئیمان‌و لەزەتی خوشوع‌و چێژی موناجاتیان کربوو!

هـــەر کەســـێکیش ئەو چێـــژو لەزەتەی تاقی کردبێتـــەوە؛ ئیدی گاڵتەی بە هەموو خۆشـــی‌و لەزەتی دونیا دێت‌و دەزانێت کە هەموو ژیانی دونیا، جگە لە خۆشییەکی خەڵەتێنەر چیدی نییە!

﴿وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلۡغُرُورِ﴾ آل عمران: ١٨٥

یەکەمیـــن ئێوارەی مانگی بەفرانبارە، کزەیەکی ســـاردە، ســـەرما بوونـــەوەری ســـڕ کـــردووە، گوێت لە جریـــوەی چۆلەکەیـــەك نابێت، دوارۆژەکانـــی مانگـــی ڕەبیعولئەوەلە، تا ئەو کاتەش کە نامەکەی منت پێ دەگات، مالاوایی لێ کردووینو لەگەڵ خۆشـــیدا، ئیدی باســـێك لە یادی پەیامبەری نازدار جێ ناهێڵێ!

ئەو کاتەی ئەم نامەیە دەخوێنیتەوە! دەفەکان بێ دەنگن!

کۆڕی ئاهەنگو مەولوود خامۆشە!

ئازیـــزم! هەمـــوو یـــادو تاســـەو خۆشەویســـتییەك، لای زۆرێك لە موســـوڵمانان، تەنها بۆتە یادێکی ســـالانەو کۆمەڵێك ســـروودو زرمەی دەفو خوێندنـــەوەی مەولوودنامەو وتارێکی ڕازاوە بە وشـــەی جوانو دەربڕینی عاتیفی!

ئیدی تا ساڵێکی دی، ئەم باسوخواسەت بەر گوێ ناکەوێ!

ئەمە هەموو وەفایەکە، بۆ ڕابەرو پێغەمبەری ئوممەتی موسڵمان.

ئەو پەیامبەرەی کە هەرگیز مرۆڤایەتی ناحەسێتەوە، تا نەگەڕێتەوە باڵی میهرو بەخشـــندەیی سوننەتو ڕێبازە پیرۆزەکەی!چونکە جگە لە ئەو، کەس خاوەنی پەیامی ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَـٰكَ إِلَّا رَحۡمَةً لِّلۡعَـٰلَمِينَ﴾ الأنبياء: ١٠٧ نییە!

بۆ ئەو هەموو خەڵکە ســـەر لێشـــواوو بەشـــخوراوو ستەملێکراوو هەناسەساردە، بۆ ئەو هەموو عالەمینە، جگە لە موحەممەد کێ پەیدا بکەین؟!



مرۆڤێك نەرمتر لە ئاوریشـــم، هێمنتر لە شەونم، ناسکتر لە گوڵ، میهرەبانتر لە دایك، پاکتر لە باران، ئارامتر لە خۆر!شەوقی دەڵێت:

وَإِذا رَحِمْتَ فَأَنتَ أُمٌّ أَوْ أَبٌ
هَذانِ فِي الدُّنْيا هُمَا الرُّحَمَاءُ

وەنەبێت من بمەوێت لە نامەیەکدا پەیامبەرت پێ بناسـێنم، یان لە دوای ســەدان ئەدیبو شاعیرو نووســەر، کە لەمەڕ ئەو نازدارەیان نووسیوە وەسفی بکەم! هەرگیز..

وەلێ، دەمەوێت لە کلاوڕۆژنەیەکەوە ئاماژە بە خۆری نبوەت بکەم، لــە جۆگەلەیەکی بچووکەوە بتانبەمە ســەر دەریای بێســنووری ئەو مرۆڤە گەورەیە!

پێغەمبەرێك کە ئیدی دوای ئەو، پێویستت بە کەس نییە!

چرایەك بۆ هەموو ڕێگاکانی بەختەوەری، نوورو ڕۆشــنایی بێت، بە مانای وشە (رحمة للعالمين) بێت!

گــەر دەتانەوێــت لەگــەڵ منداڵانــدا بیناســنو بیکەنــە ڕابەری مامۆستایانی باخچەی منداڵان؛ لە حەسەنو حوسەینو ئومامەی کچی زەینەب بپرسن..

ئەگەر دەتانەویت بیکەنە سەرمەشقی مامۆستایانی بنەڕەتی؛ ئەوا لە ئەنەسو ئیبنوعەباسو زەیدی کوڕی سابت بپرسن..

ئەگەر دەتانەوێت پێشەنگو ڕابەری مامۆستایانی ئامادەیی بێت؛ لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودو ئوسامەو ئوبەی کوڕی کەعبو موعاز بپرسن..

ئەگەر دەتانەوێت بیکەنە مامۆستای مامۆستایانی زانکۆ؛ لە ئەبوبەکرو عومەرو عوسمانو عەلی بپرسن.. ئەگەر دەتانەوێت بزانن باوکایەتی یانی چی؟! لە فاتیمە بپرسن..

ئەگەر دەتانەوێت بزانن هاوسەری نموونەیی چۆنە؟! لە خەدیجەو عائیشەو سەودەو زەینەبو تێکڕایی خێزانەکانی بپرسن!

ئەگەر دەتانەوێت سەرمەشقی جوانیو قەشەنگیو پاکوخاوێنیو شیکپۆشی پەیدا بکەن؛ وەرنە خزمەتی سوننەتە جوانەکانی، کە نەک تەنها بەوتە، بەڵکوو بە کردار بۆتان دەسەلمێنێت، کەچی تۆپەگوڵێکی بۆنخۆشو گوڵاوپرژێنێکە ئەو ڕەسولی خودایە!

ئەگەر ئافرەتان پێشەنگێکیان دەوێت؛ بۆئەوەی نموونەی پاکیو بۆنخۆشیو جوانی بن؛ با بچنە خزمەتی عائیشەو ئوم سەلەمەو ئوم سولەیمو ئافرەتانی ئەنصار؛ تا بزانن چۆن ئەو پێغەمبەرە نازدارە، ئافرەتانی کردووە بە هاودەمی میسکو عەبیر چۆن فێری کردوون، کە هەمیشە گوڵاوی عەنبەربۆی نێو ماڵو هەواری خۆیان بن!

ئەو پێغەمبەرە ناسکەی کە هەرگیز ناسکتر لە هەستی ئەو، کەس ناتوانێ گوزارشی لێوە بکات، ئەو خاوەنی زەوقو سەلیقەبەرزەی کە دەفەرموێت «حبب إلي من دنیاکم النساءو الطیب

ئەو مامۆستا بەرزەی کە ئافرەتانی بە ناسکترین شت وەسف کرد..



«رِفْقًا بِالْقَوَارِيرِ» دوای ئەوەی بە هاوشانی گوڵو گوڵاوو وەنەوشەی داناون!

بیرتان نەچێت، دواساتەکانی ژیانی لە باوەشی ئافرەتێکدا بەڕێ دەکات، لە ئامێزی ژنێکدا ڕۆحی بەرزی بەرەو لای پەروەردگاری دەفڕێت، بیرتان نەچێت دواوەسیەتیشی بۆ ئێوە بوو «اسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا».. ئێوە نازانن، تەنها موحەممەد دەزانێ ئێوە چەند ناسکن!

ئەو دەیەوێت، ئەو ناسکییەتان بپارێزێت!

ڕانی پیرۆزی ڕادەگرت؛ تا سەفییەی خێرانی بە کەوشەکانیەوە بچێتە سەری‌و سواری وشترەکەی بێت!

چ گەورەییەکە.. ڕانی پێغەمبەرێك، پلیکانەی ئافرەتێك بێت؟!

چ پیاوێکی مەردو چ باوەشێکی گەرمو چ دڵێکی پڕ لە میهرو خۆشەویستی بوویت، ئەی پێغەمبەری خۆشەویستی‌و مرۆڤایەتی‌و ئاشتی‌و برایەتی‌و پاکی‌و ناسکی‌و جوانی!

چ مرۆڤێکی گەورەی؟

ئێمەش چەند بێوەفاین بەرامبەر بە سوننەتو ڕێبازو ڕێگای ڕاستت.. دووریمان لە تۆ، چۆن لە گێژاوی زیلەتو نەهامەتی‌و داماویدا ونی کردووین!




# نامەی شەستویەک

ماموٚستاگیان، نامەی ئەم جارەت جیاواز بوو، لەبارەی کەسێکەوە دوایەت، کە هەموو پیتێك لە ژیانی ئەو مروٚڤە، تەزوو بە ڕوٚحو دڵ دێنێت!

لەگەڵ نامەکەی جەنابت، چوومە نێو جیهانێکی سەیر، دەبێت ژیان لەگەڵ خودی ئەو پەیامبەرە چوٚن بووبێت؟!

دەبێت خەندەیەك هەبێت، وەکوو خەندەی ئەو، دەبێ چرپەیەك هەبێت، ناسکتر لە چرپەی ئەو، دەبێت بۆیەك هەبێت، خۆشتر لە بۆی ئەو؟!

زۆرم هەڵوێستە کرد لەسەر ئایەتی "وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧" الأنبياء.... سەرسام بووم، چەندم کرد نەمتوانی بگەمە دەریای میهری کەسێك، کە خوداوەند بۆ هەموو جیهانی بە ڕەحمەت ڕەوانە کردووە!

مرۆڤێك، بەتەنێ یەك مرۆڤ، خودا بیکاتە میهرو بەزەییو ڕەحمەت بۆ هەموو جیهان بۆ هەتاهەتا! دەبێت چی میهرەبانێك بووبیت خودایە!!

ئازیزم، بەڕاستی هەڵوێستەکەت زۆر جوانە، میهری بەشی هەموو سەر زەوی بکات، تا ڕۆژی قیامەت.. دەبێ نەك دەریا، ئۆقیانووسی میهربێ!

دەستی نەرمی، هەستی گەرمی، با لە زاری هاوەڵانییەوە ببیستین.

ئەنەس دەفەرموێت: هیچ ئاوریشمێکم دەست لێ نەداوە، نەرمتربێ لەنێو لەپی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت)و هیچ بۆنێکیشم نەکردووە، خۆشتر بێت لە بۆنی گوڵاوی خاتەمی پێغەمبەران (سەلاتو سەلامی خودای لێ بێت).. البخاري

دەزانی ئەزیزم، ئەنەس چی دی دەڵێت؟ دە ساڵ خزمەتی پێغەمبەرم کردووە، هەرگیز ڕۆژێك بەرامبەرم ئۆفێکی نەکردووە!

بەرامبەر کارێك کردبێتم، نەیفەرمووە: بۆ کردت؟ یا کارێکم نەکردبێ، نەیفەرمووە: بۆ نەتکرد؟ البخاريو مسلم

لەنێو نوێژدا، لە کاتی موناجاتی ئیلاهیدا، لە سوژدەو کڕنووشدا بۆ خودا، لە پیرۆزترینو گەورەترین ساتەکانی پەیوەندی لەگەڵ خودادا، کاتێك گوێی لە دەنگی گریانی منداڵێك دەبوو، نوێژەکەی کورت دەکردەوە، دەزانی بۆ؟ لە کاتێکدا دەیویست نوێژەکە درێژ بکاتەوە، دەیفەرموو: (مما أعلم من شدة وجد أمه ببكائه) البخاري....

لەبەر ئەوەی دەمزانی دایکی، دڵی ژان دەکات بە گریانی منداڵەکەی!

لەسەر مینبەر، لە ڕۆژی هەینیدا،لەو کاتە گرنگەدا، کاتێك وتار دەدات بۆ هاوەڵانی حەسەنو حوسێن دێنە نێو مزگەوت، هەردووك کراسی سووریان لەبەر بووەو بەنێو ڕیزەکاندا دەهاتنو جارجار پێیان هەڵدەکەوت، پەیامبەر خۆی بۆ نەگیرا، لە ترسی ئەوەی ئازاریان پێ بگات، دابەزیو هەردووکی هەڵگرتن بۆ لای خۆیو پاشان دەستی بە وتارەکەی کردو فەرمووی «صدق الله إنما أموالكم وأولادكم فتنة» ئەو دوانەم بینی، کراسەکەیان لە قاچیان گیر دەبوو، خۆم بۆ نەگیرا، تا قسەکانم بڕیو هەڵمگرتن. (االنسائي بإسناد صحيح)

لە نوێژی جەماعەتدا، جارێك هێندە لە سوژدەدا مایەوە، هاوەڵانی ترسان شتێك ڕووی دابێتو پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێت) شتێکی لێ هاتبێت!



دواتر کە پرسـیاریان لـێ کرد، فەرمووی: نەخێـر، هیچ لەوانە ڕووی نەدابـوو، وەلێ حەسـەنی کوڕم، چووبووە سـەر پشـتم، حەزم نەکـرد پەلەی لێ بکەم، بـە ئارەزووی خۆی دێتە خوارێ! (النسـائي بإسناد صحيح)

سەیرە سەدان کەس لەدوای پەیامبەر، لە سوژدەدا دەمێننەوە، تا منداڵێك بە دڵی خۆی، تێر لەسەر پشتی باپیرەی یاری بکات!

ئـەو باپیرەیەش کێیە؟ پەیامبەری ئاخـری زەمان موحەممەدە (دروودی خودای لێ بێـت)!

بۆ چەند چرکەیەك چاوەکانت دابخەو بە خەیاڵ بچۆرە خزمەتی مزگەوتی مەدینەی مونـەوەرەو بیهێنە پێش چاوت، قامەت کرا، پۆل پۆل هاوەڵان دەسـتەو نەزەر ڕاوەستاون سەدای (الله اکبر الله اکبر، لا إله الا الله)یە لەناکاو بەدەرکەوت بەدری مونەوەر، خۆری درەخشـانو سیراجی مونیر دێتە ژووری،...

بـەڵام کێی لەسـەر شـانە؟! کێـی هەڵگرتـووە لەسـەر کۆڵی موبارەکی؟!کیژۆڵەیەك گەیشتۆتە بەرزترین لوتکە!

دەسـتەکانی نەگرتبـوو! وەدوی خۆیـدا ڕای نەدەکێشـا! لـە عارەبانەکەیدا پاڵی پێوە نەدەنا! نا، کردبوویە کۆڵی، پێیەکانی بەسەر سنگی موبارەکیدا شۆڕبووبوونەوە!

دەستەکانی لە سەرو گەردنی ئەو باپیرە میهرەبانە ئاڵاندبوو!

ئەوە (ئومامە)یە کچی زەینەب، کچەزای پێغەمبەرە!

ئەوە ڕێزو گەورەیی‌و پێدانی گەورەترین بڕوانامەی ڕێزلێنانە بە کچ‌و کچەزاکەی!

تا هەموو جیهان بزانن، ئافرەت جێگای سەر سەرە، نەک ژێر پێ!!

ڕاوەستە ئازیزم، چاوەکانت مەکەرەوە، لەو دیمەنە ئەفسووناوییە خۆت مەحرووم مەکە، چیرۆکەکە لێرەدا کۆتایی نایەت!!

لەنێو نوێژدا، سەروەرمان ئومامەی دەکردە باوەشی!

پەیامبەرێــک کە شــەقی لەهەموو گەنـــج‌و گەنجینەیەکی دونیا هەڵداو زێڕوزیوی دەخســـتە ژێر پێ، بەڵام ئافرەتی دەخستە سەر دڵ‌و نێو دڵ! لەنێو باوەشی دادەنان!

کاتێك دەچوو بۆ ڕکوع‌و سوجود دای دەنا، دواتر کە هەڵدەستایەوە دووبارە دەیکردەوە باوەشی!

یا «الله» چی دڵێکت هەبوو ئەی «محمد»؟!

چی میهرێك ئەی پەیامبەر!

چی سۆزێك ئەی بابەگیان! (١)

چی ڕێزێك، چی شکۆیەك، بۆ ئافرەت ئەی سەرکردە!

نوێژیـــش ڕێگر نییە، لـــەوەی چاودێریمان بکەی، لە باوەشـــمان بگریت، ئاگات لێمان بێت! بمانکەیتە کۆڵ!

بمانبەخشـــە! تـــۆ ئێمـــەت کردە کۆڵ، بـــەڵام ئێمە لامـــان دا لە

سوننەتی تۆ، کەسانێك هاتن، کردیانین بە کۆیلە، بەڵام ئێمە بووین بە نۆکەریان!!

بەو هەموو شکۆو گەورەییەتەوە، لەگەڵ (زەینەب)ی کچی ئوموسەلەمە، کە بە (زووەینەب) بانگت دەکردو کچی خۆشت نەبوو، چاوشارکێت دەکرد!

سەیرە خۆمان لە تۆ سەندەوەو تەسلیم بە گورگمان کرد!

(٦٣) ساڵ تەمەن، جگە لە گوڵبارانی وشە، پیتێکی کاڵت لە زار نەهاتەدەر!

ڕۆژێك دەنگ لە خێزانێکت بڵند نەکرد! پەنجەیەکت لێ بەرز نەکردەوە! نێو چەوانت لێ گرژ نەکردن!

ژیانی تۆ، هەرگیز بەمەرەکەبی هیچ خامەیەك نانوسرێ، هەرگیز کتێبێك نانوسرێ لە ژیانی تۆدا کە کامڵ بێ، نامەکەی منیش ئەم جارە بێ کۆتاییە؛ چونکە تەنها کەلامی خودا دەتوانێ وەسفت بکات، کەلامی خوداش ( وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِۦ مَدَدًا ﴿١٠٩﴾ )الکهف .

---

[1] ئاماژەیە بە فەرمووودەی (إنما أنا لكم مثل الوالد لولده...) أبوداود واتە: من وەکوو باوك وام بۆ ئێوە!




# نامەی شەست و دوو

لە تەمەنی زۆر منداڵیمدا، لەو ڕۆژەوە کە ڕەشم وەبان سپی ناو، ئەلفوبێ فێربووم، یەکێك لەو کتێبانەی کە لە کتێبخانەکەی باوکمدا سەرنجی ڕادەکێشامو تا ئێستاش وێنەی لەبەر دیدەم لانەچووە، کتێبی «عام الحزن»ی نووسەری میسری عبدالحمید جودة السحار بوو!

ئـەو کات تەنها دەمزانی بیخوێنمـەوە، وەلێ بابم پێی دەگوتم : واتە: «ساڵی خەم»!

دواتریش باسی ئەوەی بۆ کردم، کە باس لەو ساڵە دەکات کە پەیامبەر خۆشەویسترین کەسی ماڵاوایی لێ کرد، کە خەدیجەی خۆشەویستو خێزانی بوو!

ئەو ئافرەتەی لە ئاسمان ڕا، سڵاوی بۆ دەهاتو جبریلی ئەمین لە ئاسمانی حەوتەمەوە، سڵاوی پەروەردگاری مەزنی بە دیاریو مژدەو مزگێنییەوە بەخەڵات بۆ دەهێنا!

کاتێک باسی خاتوو خەدیجە دەکرێت، تەنها وەکو خێزانی پەیامبەر نێوی ناهێنرێت، ئەو خۆشەویستی پێغەمبەرە، بە شێوەیەک پەیامبەر خۆشی دەویست، کە شەیدای بووبوو، باوەشی ئەو لانەی ئارامیو حەوانەوەو پشووی ڕۆحی بوو!

ئەو ئەوینەشی بە گەورەترین خەڵاتی ئاسمان دەزانی، بۆیە دەیفەرموو: «إني رزقت حبها» رواه مسلم.

خۆشەویستییەک کە ڕزقێکی خوداییو بەهرەیەکی ئاسمانی بێت چۆن کاڵ دەبێتەوە؟ چۆن لەیاد دەچێت؟!

ئەم وتە شیرینەی پەیامبەر، لە وەڵامی خاتوو عائیشە دایە، کە پێی سەیربوو کەسێک دوای زێتر لە (١٠) ساڵو دوای ئەوەی لە بری خێزانێك، چەندین خێزانی ناوازەی پێ ببەخشرێت، هەمیشە ناوی خەدیجەی لەسەر زار بێو یادی بکات!

نەك هەر ئەوەندە، ئەو کەسانەشی خۆش بوێت، کە خۆشەویستی خەدیجە بوون.

بەشێوەیەك كاتێك قوربانیی دەكرد، دەیفەرموو: بەشی هاوڕێكانی خەدیجــە بنێرن! كاتێــك خەڵاتو دیارییەكی بۆ دەهــات، دەیفەرموو ئەمە بەرن بۆ ماڵی فلان كەسو ئەوەشی بۆ ماڵی فلان؛ چونكە ئەوانە كاتی خۆی خەدیجەیان خۆش دەویست! البخاري في الأدب المفرد.

پیرێژنێكــی موزەنی دەبێتە میوانی، پەیامبــەر بەتەواوی ڕێزو خۆشەویســتیو گرنگیدانەوە بەخێرهاتنــی دەكاتو بەگەرمی هەواڵی دەپرسێ!

خێزانەكانی پێیان ســەیر دەبێت، كە بۆ ئاوها بەگەرمیو تاسەو گرنگیدانــەوە لەگەڵی دەدوێ، ئاوا لەگەڵ ئەم پیرەژنەدا، بۆ ماوەیەكی زۆر گفتوگــۆ دەكات، پەیامبەری ئازیز لە وەڵامدا دەڵێت: ئەم ئافرەتە لە ژیانی خەدیجەدا، ســەردانی دەكردین، پاراســتنی دۆستایەتیش لە ئیمانەوەیە.

چی هەڵوێســتێكی بەرزبوو لە جەنگی بەدردا، كاتێك زاواكەی كە ئەوكات بتپەرست بوو بەدیل گیرابوو، زەینەبی كچیشی بۆ ئازادكردنی هاوســەرەكەی، ئــەو گەردانەیــەی بۆ فیــدا ناردبوو، كــە كاتی خۆی خەدیجەی دایكی كردبوویە دیاریی زەماوەندەكەی!

كاتێك پەیامبەر چاوی بە گەردانەكەی خەدیجە كەوت، دڵی هاتە لەرزیــن، ناخــی هەژاو تەزوو بە ڕۆحیدا هــات، چاوەكانی پڕبوون لە فرمێسك، ئازیزترین كەسی هاتەوە پێش چاو، خەیاڵی ئەوینی نەمرو خۆشەویســتیی بێســنوری گەڕاندییەوە ئەو كاتەی كە ئەو گەردانەیە

به گەردنی خەدیجەوە بوو، ڕۆژگارێکی هاتەوە یاد، کە لە ژێر ساباتی پڕمیهرو خۆشەویستیی خەدیجەدا دەژیا، ئافرەتێک پڕ لە زێڕو گەورەیی‌و لە پشت گەورەترین پیاوی مێژووەوە!

ئافرەتێک کە توانی، هەتوانی هەموو برینو دەردێکی پەیامبەر بێت، لە جێی باوک‌و دایک‌و هەموو کەسێکی بێت!

گەردانەکە یادگاری بیست‌و پێنج ساڵی هێنایەوە یاد، لەو ساتەوە کە هەردووکیان شەیدای ئاکارو ڕەوشت‌و جوانی‌و گەورەییەك بوون، تا ئەو کاتەی لەژێر چەتری ماڵێکدا کۆ بوونەوە!

ئەو کاتانەی هاتەوە یاد، کە هەموو ئەندامەکانی دەلەرزی‌و داوای لێ کرد دایپۆشی‌و هێمنی بکاتەوە (زملوني، زملوني).

هاوکات ئەو ئێوارەیەی هاتەوە یاد، کە گەڕایەوە هەواری خاڵی!!

هەوار خاڵییەو ژوان ساردوسڕە!

ماڵی بێتۆییم بێ چراو گڕە

ژانی ئەو شەوەی کە بۆ یەکەمجار بێ ئەوی چەشت! زۆر تاڵتربوو لە شەوی کۆچی دوایی دایکی‌و دەیان ساڵی بێباوکی‌و حیرمان‌و سەختی ژیان!

خەدیجە هەموو برینەکانی سارێژ کردبوو! توانی ئەو ئافرەتە بێت، کە هەموو پیاوێك خەوی پێوە دەبینێت! ئەو دایکە بێت، کە دەبێتە هەموو کەسێك بۆ بێکەسترین مرۆڤ!

دەبێت ئەو ئافرەتە چی مرۆڤێك بێت، کە خەونی پێغەمبەرێك بێت!؟

ئەویش کێ، «محەممەد» دروودی خودای لێ بێت!

لێرەدا تەنها بە بینینی ملوانکەیەک، فرمێسکەکانت وەکو دانەی مرواری بەسەر ڕوومەتی نورینتدا بێنە خوارێ!

ئەی دەبێت شەوانی تەنیایی، دوای کۆچی خەدیجە، چەندی بۆ گریا بی، چەندت کەلوپەلەکانی کردبێتە باوەش و بۆنت کردبێ!

لێرەدا لە نێو جەنگدا، لە یەکەم ڕووبەڕووبوونەوەدا لەگەڵ سەرانی جاهیلیەتدا، هەر خەیاڵت لای خەدیجەیە!

ملوانکەکە بۆنی خەدیجەی لێ دێ، خاکوخۆڵی بەدر بۆنی خەدیجەی گرتووە، دڵنیام پڕ بە سینگت بۆنت کردووە؛ چونکە هەر تۆ دەزانی، بۆنی ئەو کەسە چەند خۆشە کە پڕ بە وجوودت، پڕ بە هەموو دنیا خۆشت دەوێت، ئەوە ڕەمزی وەفاو خۆشەویستی و ئەوینە!!

بە چاوی پڕ فرمێسکەوە فەرمووت؛ گەر پێتان خۆشە، بەندییەکەی بۆ بەر بدەن و گەردانەکەشی بۆ بگێڕنەوە. احمد في المسند

هاوەڵە مەردەکانیشت وتیان بە چاوان ئەی نوری دیدەمان، ئەوە ئەسیرو ئەوەش ملوانکەکەی خاتوونی یەکەم!

خۆشەویستی گەورەیە، لە نێو جەنگیشدا هەر ئەو باڵادەستە، ئەمەش تۆ فێرت کردین، ئەی مامۆستای مەملەکەتی ئەوین!

نەمدەزانی دوای ٣ نیگا لە کلاورۆژنەی ژیانی پڕنووری پەیامبەری ئازیــزەوە، دەبمە میوانی مــاڵو مزگەوتەکەی، لەگــەڵ بۆنی گوڵاوی یادەوەرییەکانی ئەو پێغەمبەرە نازدارەدا، ڕۆحم لە ســوژدەیەکدا ئارام دەگرێت، کە مەگەر تەنها ئەویندارانی شــەوو مەلائیکەی مەلەکووتی ئەعلا هەستی پێ بکەن!

جــا مەدینەی مونەوەرە، کوێی یــادگاری تۆ نییە، ئەی پەیامبەری ئازیز؟ بەهەر کووچەو کۆلانێکدا دەڕۆی، بۆنی تۆیە، لە هەر دەرگایەکی حەرەمەوە دەچیتە ژووری، نووری تۆیە!

چــی ســەدایەکی ناخهەژێنــە، لە تەنیشــتی حوجرەکــەی خاتوو عائیشەوە گوێت لە چرپەی ﴿ وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذْنِهِۦ وَسِرَاجًا مُّنِيرًا ﴾ الأحزاب: ٤٦ بێت؟!

چی هەســتێکی بێوێنەیە، کە بەرامبەر مینبەرو میحرابی کەسێك ڕادەوەستیت، کە وەکو شەوقی دەڵێت:

لە تەنیشت حوجورات ڕادەوەستیو خەیاڵ دەتباتە دیوانی نبوەتو دەچیتــە خزمەت موحەممەدی باوكو هاوســەرو هاودەمو مامۆســتاو ڕابەر!

خامــە، گوزارش لــە چی بکات، ئــەو کاتەی بەرامبــەر بە گڵکۆی پەیامبەرێك هەڵوێســتە دەکات، کە زەوی هەرگیز کەڵەپیاوی وەهای بە خۆیەوە نەدیوە!!

چی بنووسێت؟ لە کوێوە دەست پێ بکات؟ چی بدرکێنێ بەرامبەر



بەو کەسەی کە حەسسان لە وەسفیدا دەفەرموێت:

وأجمل منك لم تر قط عيني وأحسن منك لم تلد النساء

خلقت مبرأ من كل عيب كأنما خلقت كما تشاء

چی بڵێم لە وەسفی کەسێکدا، کە هاوەڵان دەفەرموون، هیچ ئاوریشمێکمان نەدیوە، نەرمتر لە نێولەپی پەیامبەرو بۆنخۆشتر لە بۆی دەستەکانی، هەمیشە هەردەڵێی لە کەشکۆڵی گوڵاوفرۆشێك دەرهاتووە!

لە نێو مزگەوتی مەدینەدا دەهاتمو دەچوومو بۆنی یادگارییەکانی تۆم دەکرد، ئازیزترین ئازیزم!

بۆنی تۆ، هەرگیز کاڵ نابێتەوە!

گوڵاوێك شەونمی سرووشی ئاسمانو گوڵزاری نبوەت بێت، چۆن بۆنەکەی سەرمەدی نابێتو تا ئەبەد کەونو کائینات مەست ناکات؟

ڕەحمەتی خودا لە شێخ محەممەدی خاڵ کە لە وەسفی ئەم پەیامبەرە مەزنەدا دەڵێت:

قوربانی ناوت چەند خۆشە

ئارەقت گوڵاو بۆنت وەنەوشە

ناوت بووەتە بەستەی فریشتە

کلیلی دەرگای باغی بەهەشتە

لە نزیك مینەبەرەکەت دادەنیشتم، سیمای نوورینت، خەندە

ئەفســوناوییەکەت، شــەهدی وشــەکانت، ســەدای نیــدای پڕلەمیهرو خۆشەویســتیت، وەکــو زیباترین تابلۆی سرووشــتی خودایی دەهاتنە پێش چاوم!

دەبێت کۆڕێك تۆ ســەرۆكو گوڵزارێك تۆ سەرتۆپو مزگەوتێك تۆ پێشەواو زانکۆیەك تۆ مامۆستای بیت، دەبێت چۆن بووبێت؟!

مەگەر هەر خۆت وەســفی بکەیت، «مــا بين بيتي ومنبري روضة من رياض الجنة».

دانیشتن لە نزیك ئارامگایەك، کە ماڵی خاتوو عائیشەیەو هێندەی هەمــوو دنیا یــادو یادگاریو چرپەو هەســتی بەرزو خۆشەویســتیو میهرەبانی تێدایە! مرۆڤ سەرسام دەکات!

کاتێك بەنێو ئەو مزگەوتەدا تێدەپەڕیت کە بە دەســتەکانی خۆت لەگەڵ هاوڕێکانتدا بەردی بناغەییت دانا، ڕۆح هەســت بە ئارامییەك دەکات، پەپوولــەی دڵ هەرگیــز نایەوێــت لەو گوڵســتانە بفڕێو ئەو هەوارە بەجێ بهێڵێت!

چۆن مرۆڤ داروبەردی مەدینەیەکی خۆش ناوێت، کە خۆشەویسترین کەسمانی دوای پەروەردگار لە ئامێز گرتووە!؟

هەندێ لە پیاوچاکان، لە نێو کووچەو کۆڵانی مەدینەدا، پێڵاویان لەپێ نەدەکرد دەیانگوت: پێمان شەرمە پێ بەسەر شوێنپێی پەیامبەردا بێنین بە پێڵاوەوە!

دەبێت ئەو ڕۆژە، چی ڕۆژێك بووبێت، کە دوای تاسەو چاوەڕوانییەکی

زۆر، لەگەڵ ئەبوبەکردا گەیشتنە دەروازەی شار؟!

ئەو کاتــەی میهرت شــەپۆلی دەداو نوورت مەدینــەی کردبوو بە چراخانو بە درووشــمی «أيها الناس أفشــوا السلام، وأطعموا الطعام...» دڵەکانت کەمەندکێش دەکرد!!

ئەنەس دەڵێت: هیچ ڕۆژێك لەو ڕۆژە ڕووناکتر نەبوو، کە پەیامبەر تەشریفی هێنایە مەدینە!

مەدینەیەك کە تا قیامەت ملوانکەی «المنورة» کرایە گەردنیو بە «المدينة المنورة» ناوزەندکرا!

لــە هەموو کووچەو ڕێگاو ســەرایەکی حــەرەمو مەدینەدا یادگاری ســوننەتو ئاکاری بــەرزت وەکــو گەورەترین یادگاری تۆمــار کراوە، جگــە لە چراخانی ســوننەتو ڕێبــازی تۆ، نــوورو ڕووناکی لە هیچ کڵاوڕۆژنەیەکەوە بەدی ناکرێت!

لە شەپۆلی لافاوێکی مرۆیی دوای بارانێکی بەخوڕ دەچوو..
هێدی هێدی بە بەرگێکی ئاودامانەوە، لەگەڵ هەزاران شەیدای دڵ
پڕ لە ئاسەو خوڕپەدا، وەك پەروانەی دەوری شەم دەسووڕاینەوە!
لەگەڵ هەموو هەنگاوێکدا، لە دەرکەی ماڵی خوداوەند نزیك
دەبوومەوە!

چی ڕەوتێکە ئەو کاتەی دڵ پێش هەنگاوەکان دەکەوێت؟!
لە بری تەقەی پێ، ترپەی دڵ دەبیسی!!

دوای کۆتا تەواف، دەستەکانم گەیشتنە مولتەزەم، گەیشتمە بەر
دەرگای مەلیکولمولوك !!

بە هەر دوو دەستم باوەشم کرد بە لێواری دەرگاکەدا، سینگم نا بە
دیوارەکەوەو ڕومەتم خستە سەر چوارچێوەی قاپیی ماڵی پەروەردگاری
بەخشندەو میهرەبان!

«یا الله» گەیشتومەتە کوێ!

لە بەر دەرگای چی پادشایەك ڕاوەستاوم، خۆم هاویشتۆتە ناو
هێزی چی میهرێك؟ بەر دەرکەی کێم گرتووەو داوا لە کێ دەکەم؟!

چۆن گەیشتومەتە ئێرە! چۆن ڕێم پێ درا بگەمە ئێرە!

منێك بە کۆڵێ تاوانو گوناهەوە، ئێستا بە ئەسرینەکانم بەر دەرگای
خوداوەندی گەورە ئاو پرژێن دەکەم!؟

سبحان الله پەروەردگارم
لە گەورەیی تۆو لە بچووکیی من!

له میهرەبانی تۆو له تاوانباریی من!

له بەخشندەیی تۆو له کەمتەرخەمیی من!

له دەوڵەمەندیی تۆو له هەژاریی من!

له هێزو دەسەلاتی تۆو له لاوازیی من!

له لێبوردنی تۆو له سەرپێچیی من!

خودایە دوای تەمەنێك له ئاوارەیی‌و نا بەڵەدی، گەڕاومەتەوە بەر قاپێکەی تۆ، دوای زەمەنێك له تاوان‌و یاخیبوون، خۆم ڕادەستی تۆ کردەوە!

له سنووری بێسنووری مەملەکەتی تۆدا خۆم حەشار دەدا.

له ژێر چاوی تۆدا تاوانم دەکردو سەدان جار پەیمانم شکاندو داوای لێبوردنم کرد، دووبارەش دەگەڕامەوە سەر تاوان‌و عیصیان!

هۆ خۆشەویسترین کەسم!

هەی کەسی بێکەسان، هەی تاقەکەسم!

هەی پەنای بێپەنایان!

هەی هیوای بێهیوایان!

هەی نەوای بێنەوایان!

هەی میهری گوناهباران..

خودایە، خۆشەویستانمان یەك هەڵەمان لێ ببینن، لێمان تووڕە دەبن، لیمان دەتۆرێن، جێمان دێڵن، گومانی خراپمان پێ دەبەن!

وەلێ تۆ، هەزاران هەزار هەڵەو پەڵەو تاوانمان دەبینی، کەچی لێمان

دەبووری، بانگمان دەکەیت، پێمان دەڵێیت رامەکەن، بەڵکو راکەن بۆ

لام ﴿ ويرزاق الله ﴾ دادرده..

بۆ ئەوەی خەجاڵەتمان نەکەیت، بە ئازیزەکەتدا هەواڵمان بۆ دەنێریت، کە هەرچی بکەین هەر بە بەندەی خۆتمان قەبووڵ دەکەیتو لێمان دەبووریت.

﴿ قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ﴾

الزمر: ٥٣

ج میهرەبانی ئەی «کەریم» ئاگاداری خەیاڵاتێکی کە لە نێو خوێنماندا دێتو دەچێ، وەلێ دامان دەپۆشی!

سەترمان دەکەی، ئەی سیتتیری هەموو گوناهباران.

هەر کەسێکی دیبا، هەرگیز رێگای نەدەدا، بەندەیەك کە لە تەوقی سەری را، تا پەنجەکانی پێی تاوانە، بێت بەر دەرگاکەیو بانگی بکات.

داوای لێ بکاتو لێی بپارێتەوە!

خودایە ئەگەر بەخشندەیی بێسنووری تۆ نەبا، ئێمە ئەوەندە چاوقایم نەدەبووین، ئەگەر هیوا بە کەرەمو لێبوردنی بێکەوشەنی تۆ نەبا، ئەوەندە نەماندەوێرا هێندە گوناه بکەین!

خودایە هێندەی خۆشمان دەوێیت، هێندەش لێت دەترسین، بەڵام ترسمان بە خۆشەویستی سپارد! عەزابمان بە عەفو سپارد!

وەنەبێ ترسان لە سزای سەختی تۆمان فەرامۆش کردبێت! هەرگیز..... بەڵام ناوێرین باسی بکەین!

بەندەی گوناهبار جگە لە چاوبڕین لە پاداشتو بەزەییو لێبوردن، چاوی لە چییە؟!

ئازیزم: مولتەزەم، دەفەرێکە ڕۆح تیایدا دەفڕێت بەرەو عەرشی کردگار!

دڵ دەگاتە ئۆخژن، ئەوێ مونتەهای هەموو هیواو ئاواتو ئەمەڵێکە، هەستکردنە بە سروەی بەهەشتو چرپەی فریشتەو ڕازونیازی ئەویندارانی حەقیقی!

هەرگیز ناتوانم وەسفی ئەو ساتانەت بۆ بکەم کە دەستم بە دەرگای ماڵی «الله»ەوە گرتبوو، وام دەزانی دەستم بە قەوائیمی عەرشەوە گرتووە!

دەپاڕامەوە بە شێوەیەک، وام دەزانی گەیشتوومەتە «سیدرەتولمونتەها» تەنها ئەوەندە دەزانم لە خۆشیدا دەفڕیم!

ئەوەندەشم بیرە، کە زۆر دوعام بۆ کردیو لە خوداوەند بۆت پاڕامەوە!

هاتنەوەی خۆشەویستێك، گەڕانەوەی موسافیرێك، دوای زەمەنێك تاسەو چاوەڕوانی، ڕووداوێکی بێوێنەیە، مرۆڤ هەندێجار وەها ڕووداوێك بە خەیاڵ وێنا دەکاتو باوەڕ ناکات، واقیعەن بێتە دی!

ئەو کاتەی هیلالی ڕەمەزان، لە کەل ، بەعیشوە خۆی دەنوێنێو لەگەڵ لەشکری فریشتەدا، دەبێتە میوانی گەردوون.

ئەو کاتەی سەکینەو میهرو بەزەیی خوداوەند، وەکو ڕێژنەی بارانی بەهار، بەسەر کەوندا دەباری!

ئەو کاتەی زەوی دەبێتە دەڤەری پەپوولەو نیشتیمانی گوڵو خەندەی ئەفسووناویو نیگای پڕ لە خۆشەویستی!

ئەو کاتەی کووچەو کۆڵانەکان پڕ دەبن لە مرۆڤ!

ئەو ساتەی ڕەمەزان دێتو لەگەڵ خۆیدا ناسنامەی مرۆڤەکان دابەش دەکات!

ئەو ساتانە هەرگیز لە یاد ناکرێن!

ساتەوەختی دیداری نوورو ژوانی میهرو لیقای ڕۆح، چۆن لە یاداشتی دڵدا دەسڕێتەوە!

ئەم ئێوارەیە ناوساجیمان هەبوو، پێم گوتن: بۆنی ڕەمەزان دەکەم، لە هەموو پاروویەکدا هەستم بە تامی ڕەمەزان دەکرد!

کپیی ئەم ئێوارەیە لە کپیی ئێوارانی دوای بەربانگی ڕەمەزانی دەکرد!

ئەو کاتەی هەموو بۆ سەر سفرەی ڕەمەزان رادەکەین!

ئەو کاتەی بۆ پاکبوونەوە بە زەریایەک گوناهو تاوانەوە، خۆمان دەهاوێینە نێو دەریای ڕەحمەتی تۆ، تا پاک بینەوە!

هەست بە تەپەی پێیەکانت دەکەم، ئێستاش وەکو منداڵی، وێنەی تۆ لای من مامەپیرەیەکی ڕیشچەرمووی، دەمبەخەندەو کۆڵێک دیاریت بۆ هێناوین!

بەڵام ئەفسووس، ئەوسا تەنها چاوەڕێی نوقڵو شیرینی بووم!

ژیانی ئێمە بە نوقڵێك شیرین دەبوو!

ئێستا ئێمە منداڵیی خۆمان لە دەستدا، ژیانمان هێندە تاڵ بووە، بە هەموو نوقڵی دونیا شیرین نابێت!

جاران؛ دڵمان، لەپی دەستمان، سیماو نێوچەوانمان، ددانەکانیشمان ، وەکو بەفر سپی بوون!

وەلێ ئێستا هەمووی قەترانە! بەهیواین لە هاتنی تۆدا سپیان بکەینەوە!

ئازیزم، کاتێك ئەم نامەیەت پێ دەگات، لە ژێر سێبەری ساباتی مانگی پیرۆزی ڕەمەزاندا هاوڕێی بەرماڵو سیوالکو قیامو صیامو هاورازی سەحەرو زوحاو هاودەمی زیکرو تەسبیحو تەهلیلی!

جارێکی تر بە نەسیمی سەحەری ڕەمەزان، گوڵاوپرژێنی ڕۆحت دەکەیت.

لە درێژایی سی شەوی ڕەمەزاندا، چرایەک لە نێو دڵو ماڵو کووچەو کۆڵانی ژیانتدا دادەگیرسێنێت، فریشتەئاسا غەرقی بەحری نوور دەبێت.

ئەو ساتانەی موصحەفەکەت لە ئامێز دەگریو ئەسرینەکانت بەرۆکت تەڕ دەکەنو وشکەڵانی سینگت ئاوپرژێن دەکەن.

جارێکی دی دڵە شکاوەکەت بۆ لای گەورە ئەویندار خۆی دەگەڕێتەوە.

جارێکی دی بڕست دەدەیتە خۆتو خۆت کۆدەکەیتەوەو لە نوێژی دڵدا دێیتە سەفی ئەویندارانی خودا.

بۆ جارێکی دی دێیتەوە هۆش، چاوت بە کلی نیگای ئیلاهی سورمەرێژ دەکەی!

ئەوسا لە گۆشەنیگای دڵەوە، بۆ مەلەکوتی ئەعلا دەڕوانی، ئەوسا هەست بە بەرزی ئاسمان دەکەیت!

دەتەوێت گەردانەی «عوتەقاء» لە گەردن بکەیت!

بەرامبەر بە کەرەمی ئیلاهیو میهرو بارانی ڕەمەزان، نازانی چۆن لە شەرمەندەییدا سەر هەڵبڕی!

ئازیزم، ئەگەر هەموو ساڵێک ئەم ڕەحمەتی خودایە نەبا، لە کوێدا باری گوناهو تاوانمان دانابا؟ دەریای لێبوردنی خودایی نەبا، لە کوێ چڵکی گوناهەکانمان شوشتبا؟ گوڵاوی میسکرێژی ڕۆژووەوانان نەبا، بۆنی بۆگەنی دونیاویستیمان چۆن لە خۆ داڕنیبا؟

ئەو دەرگای تەوبەو گەڕانەوە بۆ لای خودا نەبا، لە کام دەرگامان بدایە؟! تاقە دەرگایەك كە هەرگیز کەس دەرناکاتو هەرگیز بە ڕووی کەسدا داناخرێت!

دەرگایەك كە ڕێگای هەموو خەونو هیواکانی ئێمەیە، با ڕوو بکەینە خاوەنی ئەو دەرگایە، ئەو خودایە بۆ هەموو تاوانەکانمان لێخۆشبوونی ئامادەیە، خاوەنی ﴿وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ﴾الأعراف: ١٥٦ و.. ﴿وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا﴾ طه: ٨٢ و.. ﴿إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا﴾الزمر: ٥٣

هەلەو تەنها هیممەتی دەوێت، ڕەمەزان مانگی نەسرو مانگی بەدرو مانگی فورقانە، هەمیشە بەهاری تەقوای ئەهلی ئیمانە.

ئێواران.. وەکو بەندەیەکی کزۆڵ، بە دیار سێ دەنکە خورماو پەرداخێك ئاوی ساردەوە، دەستەکانت هەڵبڕە، تۆ دەستت بۆ یەکێك بڵند دەکەیت، هەرگیز کەسی بێئومێد نەکردووە، تا تۆ بێئومێد بکات!

ئەو کاتەی ئەم نامەیەت بۆ دەنووسـم لە درەنگانی عەسـری ڕۆژی ٢٩ ڕەمەزانـدام، هێـدی هێـدی ئـەو میوانەی کە چەندیـن مانگ لە چاوەڕوانیدا بووم‌و مانگێکە هۆگری بووم، ماڵاواییم لێ دەکات.

ئـەو ٢٩ ڕۆژە هەروەکو ئەوەی فریشـتەیەك لە ماڵەکەماندا میوان بێـت، هەروەکو ئەوەی نێردراوێکی خوداوەند لە ئاسـمانەوە هاتبێتە خوار بۆ گوڵاو بارانکردنی ڕۆحمان‌و شەونم بارانی ماڵەکەمان بە فەڕو بەرەکەتی ئیلاهی.

ئەم چەند ڕۆژە کوچەو کۆڵانی ماڵ‌و مەنزڵ بۆنی پەڕەی قورئانی گرتبوو، سپێدەی مزگەوتەکەمان بۆنی هەناسەی فریشتەی لێ دەهات..

ئێواران لێومان بە پەرداخەکانی کەوسەرەوە دەنا!

ڕەحیقی فیردەوسـمان دەخواردەوەو هەستمان بە حەلاوەتی ئیمان دەکردو لەگەڵ دەنکە خورماکاندا ڕۆحی شیرینتر دەکردین..

مانگێك لـە ژوان لەگەڵ قورئاندا، لە نێو باخچەکانی ڕیزواندا، ٢٩ شـەو ژوان لەگـەڵ موناجاتی ئیلاهی‌و چرپـەی ڕۆح‌و واڵاکردنی دڵ‌و بەرزکردنەوەی سکاڵا بۆ دیوانی کردگار..

مانگێـك لە گەڕانـەوەی دڵێکی شـکاو، مانگێك لـە ڕێژنە بارانی ئەسرینی نەدامەت، مانگێك لە داواکردنی عیتق و لێخۆشبوون..

مانگێك پاڕانەوە بۆ وەرگرتنی مەدالیای "عتقاء رمضان"

مانگێك لە ئاوێتە بوونی ڕۆح لەگەڵ صیام‌و قیام‌و نزای سەحەردا!

زەمەنێك لە پشوی ڕۆحو ژیان لە باوەشی ئارامی قورئانی پیرۆزدا.

مانگێك لە پابوونەوەی ڕۆحو لابردنی ژەنگی تاوان!

مانگێــك لە گەڕانەوە بۆ دەفەری مــرۆڤو تێکەڵبوون بە دەفەری فریشتە!

مانگێك لە خوێندنی وانەی ئەوینی ئیلاهی، ئەوینێك خۆشەویستر لە ئاوی سارد لە گەرماترین ڕۆژی هاویندا!

٢٩ ئێوارەی بەهەشتی! لەگەڵ ئاوازی "اللهم لك صمت وبك امنت"دا.

٢٩ ئێوارە لە جوانترین دیمەنی ئاوابوونی خۆر!

٢٩ شەو لە جریوەی ئەستێرەو تریفەی مانگەشەو!

٢٩ شەو لە پروشەی میسكو گوڵاوی تەراویح!

٢٩ شەو لە قیامو قنوت لە میحرابی ئەوینی خوداییدا!

کاتێك کە ڕەمەزان دەهات، پێشەوا عومەر دەیفەرموو "مرحبا بمطهرنا من الذنوب"!

ڕەمەزان وەرزی پاکبوونەوە لە گوناهـ و تاوانو ئاشتبوونەوە لەگەڵ خودایە!

لەوێدا بە ئاشاکرا هەست بە لوتفو کەرەمی ئیلاهی دەکرێت.

دەبینیــت چۆن پەروەردگار ڕێگاکانی هیدایەتت بۆ ئاســان دەکاتو چوارمێخەی نەفسی ئەممارەو ئیبلیسی نەفرەت لێکراو دەکێشێت!

ئەدی ئێستا؟!



ئازیزم ڕەمەزان ڕۆیشتو ماڵاوایی کرد، وەلێ بەندایەتی بۆ خوداو ملکەچبوون بۆ فەرمانەکانی خودا کۆتایی پێ نایەت، تا ڕۆح لە لاشەماندا بێتو هەناسە لە سینەماندا مابێ ئێمە بەندەی خوداین "واعبد ربك حتى ياتيك اليقين".

ئەو خودایەی کە لە ڕەمەزاندا بە گەرمیو تاسەوە فەرمانەکانی جێبەجێ دەکرێنو پەرستشی بۆ ئەنجام دەدەین، خودای هەموو مانگەکانی دیش هەر ئەوە! ئەو هەمیشە خودای ئێمەیەو ئێمەش هەمیشە بەندەی ئەوین!

ئێستاش دوای ماڵاوایی ئەم مانگە پیرۆزە، تکاکارین لە دەرگای پەروەردگار ڕۆژوو و نوێژو نزاو پاڕانەوەکانی گیرا کردبین، لە هەموو کەموکورتییەکی ئێستاو هەمیشەو بەردەوام داوای لێخۆشبوون دەکەین..

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز نامەی بۆ هەموو ناوچەکان دەنارد کە کۆتایی مانگی ڕەمەزان بە "استغفرالله" و داوای لێخۆشبوون بهێنن، دەیفەرموو بڵێین وەکو باوکتان ئادەم فەرمووی:

﴿رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ﴾ الأعراف: ٢٣

بڵێین وەکو نوح پەیامبەر فەرمووی: ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّىٓ أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَسْـَٔلَكَ مَا لَيْسَ لِى بِهِۦ عِلْمٌ ۖ وَإِلَّا تَغْفِرْ لِى وَتَرْحَمْنِىٓ أَكُن مِّنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ﴾ هود: ٤٧

بڵێن وەکو ئیبراهیم پەیامبەر فەرمووی: ﴿وَٱلَّذِىٓ أَطْمَعُ أَن يَغْفِرَ لِى خَطِيٓـَٔتِى يَوْمَ ٱلدِّينِ﴾ الشعراء: ٨٢

بلێین وەکو موسا پەیامبەر فەرموی: ﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي فَاغْفِرْ لِي فَغَفَرَ لَهُۥٓ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴾ القصص: ١٦

بلێین وەکو یونس پەیامبەر فەرمووی: ﴿ وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبًا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقْدِرَ عَلَيْهِ فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبْحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٨٧ ﴾ الأنبياء: ٨٧

دەبا ئازیزم هەوڵدەین هەموو ڕۆژەکانمان لە ڕۆژە پڕ نورەکانی ڕەمەزان بچێت.

دەبا شەوەکانمان لە تروسکەی شەوانی قەدر بێ بەش نەبن.

دەبا جارێکی دی دڵەکانمان نەبێتەوە پەرێزو بە خورپەی خەوفو موچورکی ڕۆح نامۆ نەبن!

دەبا ئیدی کانیی چاوەکانمان وشك نەکاتو بەرماڵەکەمان بە هەنسکی شەوو فرمێسکی سەحەر نامۆ نەبن!

با بەندەیەکی ڕەببانی بین، نەك ڕەمەزانی!

دەزانم ئێستا، لەشکری خەم گەمارۆی داویت، بەڵام دڵنیام چرپەی ﴿لَا تَحْزَنْ إِنَّ اللَّهَ مَعَنَا﴾التوبة: ٤٠ وەکو سروەی شەماڵیکی هێمن، دڵە بچکۆلەکەی لەباوەش گرتووی؛ چونکە دەزانیت کە لەدژوارترین ساتە وەختەکانتا، خودایەك هەیە هەرگیز فەرامۆشت ناکات.

دەزانیت ئەگەر دوژمنەکانت لەشکرکێشی دونیا بکەن، تۆ پشتت بە هێزێك قایمە، کە هەرگیز شکست نازانیّ!

چونکە تۆ پەروەردگارێکت هەیە، کە جگە لە خۆی، کەس ژمارەی سەربازەکانی نازانیّ؛ ﴿وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ﴾المدثر: ٣١.

دەزانیت خوداوەند ئاگاداری هەموو شتێکەو هەرگیز بێئاگا نابێت، ئەوەی لەسەر ئێمەیە، بەندایەتی بۆ ئەنجام بدەین‌و پشتی پیّ ببەستین، ئەویش بەتەواوی چاوی لێمانە؛ چونکە ئەنجامی هەموو ڕووداوەکان، بۆ لای ئەو دەگەڕێتەوە، سەرەتاو کۆتایی هەموو کارەکان، بە ویستی ئەوون. ﴿وَلِلَّهِ غَيْبُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَإِلَيْهِ يُرْجَعُ الْأَمْرُ كُلُّهُ فَاعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ وَمَا رَبُّكَ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ هود: ١٢٣

لە سەختترین بارودۆخدا پەلەقاژە ناکەیت، ئارامیت، ڕێگە نادەیت لەشکری خەم دەروونت داگیر بکات...

تەنها یەك ڕووگەت هەیە، تەنها یەك هێزو یەك خودا، کە ئیدی لە دوای ئەو، ئاتاجت بە کەس نییە!

چارەسەری هەموو کێشەکانت، کردنەوەی هەموو گرێکان، ڕەواندنەوەی هەوری ڕەشی خەمەکان، شکاندنی پشتی دوژمنان‌و دوورخستنەوەی

هەموو بەڵاو نەهامەتییەکان هەمووی تەنها لەدەسەڵاتی ئەون!

﴿وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَـٰلِغُ أَمْرِهِۦ﴾ الطلاق: ٣.

ئەوەش بزانە کە هەموو ڕووداوەکان سنووردارن، تەواو دەبن و بەردەوام نابن، گرنگ ئەوەیە، لەو تاقیکردنەوەی خودایەدا دەربچین، ﴿قَدْ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَىْءٍ قَدْرًا﴾ الطلاق: ٣.

مەترسە ئازیزم، هێمن بەو لە کلاوڕۆژنەی بەڵێنی ﴿أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾يونس:٦٢، وە تەماشای ئایندەی ڕوونت بکە!

لەبیرت چوو، کاتێک فیرعەون هەزاران کۆرپەی سەربڕی؛ تا موسا لەدایک نەبێت، وەلێ کاتێک لەدایک بوو، لەماڵەکەی خۆیدا بەخێوی کرد!

بەڵا، ئەوە نییە کە تووشی کارەساتی گەورە بین، دووژمنەکانمان بەهێزو بێبەزەیی بن، کەس نەبێت پارێزگاریمان لێ بکات!

بەڵکو گەورەترین بەڵا ئەوەیە، کە باوەڕمان بە مەعییەتی خودا لاواز بێت، لەیادمان نەمێنێ، کە ﴿قَالَ لَا تَخَافَآ ۖ إِنَّنِى مَعَكُمَآ أَسْمَعُ وَأَرَىٰ﴾ طه: ٤٦، بەڵێنی خودایە بۆ هەموو کەسێک کە وەکو موساو هارون خۆیان تەسلیمی خودا بکەن! وەلێ گەر ترس ڕووی تێکردین؛ ئەوا ترسناکی لێرەدایە!

ئەی نازانی کاتێک یاقوب پێغەمبەر وتی: ﴿وَأَخَافُ أَن يَأْكُلَهُ ٱلذِّئْبُ﴾ یوسف: ١٣

یوسفی لێ دوور خرایەوەو سۆمای چاویشی لەدەست دا! بەڵام کاتێك وتی: ﴿وَأُفَوِّضُ أَمْرِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾غافر: ٤٤ پەروەردگار یوسفی بۆ گەڕاندەوەو چاوەکانیشی پێ دایەوە!

ئەبو عەلی دەققاق دەڵێت: تەوەککول سیفەتی باوەڕدارانە، تەسلیمبوون سیفەتی ئەولیاکانە، ڕاسپاردنی هەموو کارەکان بە خودا سیفەتی ئەهلی تەوحیدو یەکتاپەرستانی ڕاستەقینەیە!

هەربۆیە تەوەککول سیفەتی عەوامی باوەڕدارانو تەسلیمبوون سیفەتی خەواصو کارسپاردن بە خودا، سیفەتی خەواصی خەواصە!

دواتر لە وتەیەکی دیدا تەوەککول دەکات، بە سێ بەشەوەو دەڵێت: (التوكل ثم التسليم ثم التفويض)، واتە: سەرەتا تەوەککولو پشتبەستن بە خودا، دواتر تەسلیمبوونی کوللی بە خودا، پاشان سپاردنی هەموو کارو ڕازونیازەکان بەخودا.

هاوکات لەسەر وتەکانی بەردەوام دەبێتو دەڵێت: کەسی موتەوەکیل بە وادەو بەڵێنی خودایی سوکنایی دڵی دێت، ئەوەش کە خۆی داوەتە دەست خودا، متمانەی بە زانینو ئاگاداری خودا هەیە، ئەوەش کە هەموو کارێکی ڕاسپاردەی خودا کردووە ڕازییە بە حوکمی خودا، ﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا﴾ النساء: ٨١

کەسێك کە خوداوەندی گەورەو دەوڵەمەندو زاناو داناو تواناو خاوەن دەسەڵاتی بێسنوور وەکالەتی هەموو کارەکانی قەبووڵ بکاتو کەس نەتوانێ فەرمانی ڕەت بکاتەوە، ئیدی بۆ دەبێت بترسێت، بۆ

دەبێت خەمبار بێت، کاتێك دەزانێت کە هەرچی ڕوو دەدات، لەنێو مولکی ئەودایەو بێئاگاداریو ویستی ئەو ڕوو نادات. ئیدی دەبێت خەم لە چی بخۆین؟!

ئیدی بۆ لابردنی هەموو ناهەمواریيەك جگە لە ئەو پەنا بۆ کێ ببەین؟!

کابرایەکی هەژار، چوو بۆلای کابرایەکی دەوڵەمەند؛ تا سکاڵای حاڵی خۆی لا بکات، کە گەیشتە لای بینی نوێژ دەکاتو دەستەکانی بەرز کردووەتەوەو دەپاڕێتەوە لە خودا!

کە ئەوەی بینی لە خۆی پرسی، من بۆ لای کێ هاتووم؟!

خۆ ئەمەش هەژاری لای خودایەو لەو دەپاڕێتەوە، ئەدی بۆچی من هاتوومو سکاڵای خۆم لای بەندەیەك دەکەمو خودای گەورەم فەرامۆش کردووە!

حاتەمی ئەصەم چوو بۆ حەجو ماڵو منداڵەکەی دایە دەست خودا، پاش چەند ساتێك لەبری ئەوەی بچنە بەر دەرگای خەڵکی بۆ سواڵ، شازادەیەك بۆ جامێ ئاو هاتە بەر دەرگاکەیان!

دڵنیام ساتێك دڵمان بەتەواوی تەسلیمبوون بدەینە دەستی خودا، ساڵێك بەختەوەرمان دەکاو هەرچی داواکەین دەمان داتێ!

بەڵام کوا ئەوساتە ئازیزم؟!

﴿ يَٰقَوۡمِ إِن كُنتُمۡ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ فَعَلَيۡهِ تَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّسۡلِمِينَ ﴾ یونس: ٨٤

